**<u>لیوای یەکی پاراستنی سلێمانی</u>**

# دەروونناسی سەربازی

**وەرگێرانی**

**ملازمی دوو**

**هێمن قادر حسین**

# دەروازەی یەکەم

## پێشەکی

دەروونناسی توێژینەوەیەکی زانستییە بۆ لێکۆڵینەوە لە ئەندێشەی مرۆڤ. زیاتر ئەم زانستە لە پەیڕەوی کردنەوە وەرگیراوە وەك لە زانست و تیۆری. بە پلەی سەرەکی و لە پێشینەی کارەکانی دەروونناسی گرنگی بە لایەنی ڕەفتار و، ڕێکخستنی کارەکانی مرۆڤ دەدات. هەوڵ دەدات شیکاری و، توێکاری کێشە جۆراو جۆرەکانی مرۆڤ بکات.. دوای دەرکەوتنی دەر ئەنجامەکانی چارەسەریان بکات، لە هەمان کاتیشدا دەرونناسی لە گۆڕەپانی سەربازیشداکار دەکات.

لێرەدا بەپێویستی دەزانم کە لەم بوارەدا ئاماژەیەك بە گرنگی دەروونناسی بدەم، بە ئامانجی ئەوەی تاك بتوانێت بەرهەمی باشتر پێشکەش بکات، لێرەوە دەبینی کۆمەڵگە نوێکان بە سود وەرگرتن لە زانست و، تیۆریای دەروونی کار لەسەر لایەنە جۆراو جۆرەکانی سەربازی دەکەن.

## لیوای یەکی پاراستنی سلێمانی

لەم ڕوانگەیەوە بە پێویستمان زانی ئەم کتێبە لە ژێر ناونیشانی دەروونناسی سەربازی (علم النفس العسکری) وەربگێڕین، چونکە کۆمەڵگەی ئێمەش خاڵی نییە لە دامەزراوە سەربازییەکان، کاری سەرەیکی ئەم دامەزراوانەش کۆشش کردنە بۆ گەڕاندنەوە و، پارێزگاری کردن لە ئاشتی و، ئارامی و، بەرپەرچ دانەوەی هەر ڕوداوێکی نەخوازراوی ناوخۆیی و، دەرەکی.

## دەروونناسی سەربازی چییە؟

گرنگی دەدات بە کەسێتی سەرباز و پەیوەندییەکانی بە سەرو خۆیەوە و، تا دواپلەی سەربازی، لە جێ بەجێکردنی ئەرکە سەربازییەکانی لە کاتی ئاشتی و جەنگ و، تۆکمەکردنی ڕەوشتە ئیرادییە ئەرێنییەکان و، بەهرەو کارامەیی و، دڵبەندکردنی سەرباز بەو سوپایەی کە کاری تێدا دەکات، بەپێچەوانەی دەروونناسی جەنگی، کە بەشێکە لە دەروونناسی گشتی، گرنگی بە پیادەکردنی بنەمای سایکۆلۆژی و، دەروونی دەدات، لە ژینگەیەکی تایبەت بە ژیانی سەربازی، کە هەموو سەربازێك توشی دەبێت، کۆمەڵەی دەروونناسی ئەمەریکی بەشێکی تایبەتی تەرخان کردووە بە دەروونناسی سەربازی، ئەم بەشە گرنگی دەدات بە پێگەیاندنی لایەنی دەروونی سەرباز بۆ ئەوەی بە باشی ئەرکەکانی جێ بەجێ بکات.

ئاماژەشیان بەوە داوە ئەمە بەشێکە لە دەروونناسی پراکتیکی، گرنگی بەچارەسەرکردنی کێشەکانی هێزە چەکدارەکان دەدات بە ئەفسەر و، سەربازیشەوە، وەك هەڵبژاردنی کەسی شیاو بۆ بەرپرسیارێتی و پلەی تایبەت،

دابەشکردنیان بەسەر یەکەکاندا بەپێی حەز و، ویست و، ئارەزوی خۆیان و، هەروەها لەوێش هەڵبژاردنی ئەو شوێنەی کە پسپۆڕییان تیایدا هەیە، لە هەمان کاتیشدا گرنگی بە مەشق و ڕاهێنان لەسەر ئالەت و پێداویستی و کەل و پەلە جەنگییەکان دەدات، لەم ڕوانگەیەوە بنەمای ئەندازیاری مرۆیی لەسەرو هەموو ئەوانەوە پیادە دەکرێت کە بونەتە سەرباز و، خوێندنەوە بۆ هەموو ئەو هۆکارانە دەکرێت دەبنە مایەی بەرزکردنەوە و، ڕوخاندنی ورەی سەرباز، هەرچەند ئەمانە و، شتانی دیکەش جگە لە دەروونناسی کاریگەری لەسەریان هەیە، بەڵام نابێت کاریگەری دەروونناسی پشتگوێ بخەین، وەك چۆن گرنگی بە هونەرەکانی جەنگ دەدرێت بەهەمان شێوەش پێویستە گرنگی بە هۆکارەکان و، شێوەی بیرکردنەوەو و، ڕەفتار و، مامەڵەی سەربازی بدرێت.

دەروونناسی سەربازی خوێندنەوەی بۆ هەموو ڕەهەندە دەروونییەکان، لەسەرجەم چالاکی و، ئەرکە سەربازییەکان هەیە. وەك هەر زانستێکی دیکەی، لەوانە دەروونناسی ئەندازیاری، دەروونناسی بەڕێوەبردن، دەروونناسی کۆمەڵاتی و، پیشەوەری، ئەمیش گرنگی بە تایبەتمەندیەکانی کۆمەڵەو تاقمە سەربازییەکان دەدات، کە سەر بە هێزە چەکدارەکانن. هەموو گۆڕانکارییە فیسۆلۆجی و، هونەری پێوانەیی، دەروونی،

**عەقڵی، کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر کەسانی سەرباز و، هێزە چەکدارەکان لە پێشکەشکردنی کارو فەرمانەکانیان، تەنانەت ژاوەژاو، مۆسیقا، ڕەنگەکان، گەرما و، سەرماش کاریگەری تایبەت بەخۆی هەیە لەسەریان.**

**دەروونناسی سەربازی دێت کاردەکاتە سەر لایەنی دەروونی سەربازو وای لێدەکات بە باشترین شێوە ئەرك‌و فەرمانەکانی پیادە بکات و، چالاکی و، توانای زیاتر و ئەرێنی تربێت.**

**دوای ئەوەی هەموو سوپاکان گرنگی زیاتر بە بواری زانست‌و بنەماکانی سەربازی دەدەن دەروونناسی سەربازی ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر گرنگ دەبێت، چونکە زیاتر خۆشەویستی پیشەکەیان لە دڵیاندا دەچەسپێت، بۆ زیاتر خۆماندو کردن لە ڕاهێناندا و، بەڕێوەبردنی سەربازی و، بەرزکردنەوەی گیانی جەنگاوەران و، چالاککردنی ئاراستەی مەعنەوی، هێزە چەکدارەکان زیاتر بەهێز دەبن لە ڕوبەڕوو بونەوە بەرامبەر هەموو دەنگۆ و، پوچگەرایی و، بەرپەرچ دانەوەیان و، بڵاو کردنەوەی گیانی دادپەرورەی و، سەروەری یاسا، کە هێزە چەکدارەکان کاری بۆ دەکەن، لە هەمان کاتدا گیانی مەعنەویەتی دوژمن تێك دەشکێنێت و، بەرەو هەڵدێری دەبات، دەروونناسی سەربازی لە ژێر سایەی دامەزراوە سەربازییەکان کاردەکات‌و خزمەت بەو**

دەكات. ئەم زانستە هاوكارى كەسى مەدەنى دەكات دواى ئەوەى لە ژيانى مەدەنى خۆيدا ڕويكردوەتە ژيانى سەربازى.

بۆيە پەيوەندييەكى زۆر بەهێز هەيە لە نێوان پياوانى هێزە ئەمنييەكان و، زانايانى بوارى دەروونناسى، بۆ هاوكارى كردنى يەكتر لە ئەنجامدانى توێژينەوەى مەيدانى كە زانايانى دەروونناسى لەگەڵ شارەزايانيە سەربازيدا پێكەوە شان بەشانى يەكتر كاردەكەن بۆ دۆزينەوەى ڕێگە چارەى نوێ و، هاوچەرخ، يەكێكە لەو بابەتانە كە زۆر گرنگە خوێندنى دەروونناسى سەربازيدراوە، تا ئاستێكى بەرز لە هەندێك زانكۆكاندا توێژينەوەى ماستەر و، دكتۆراى لەسەر وەرگيراوە و، كراوە بە مەنهەج.

## هۆشيارى سەربازى پێش خۆ ئامادەكردن بۆ جەنگ:

هۆشيارى سەربازى پشت بەمانە دەبەستێت: بەهاندانى سەرباز بۆ پارێزگارى كردن لە بيرو باوەڕ و، نيشتيمان و، نەتەوە و، ئارامى و، سەقاميگير و، تێكۆشان بۆ بەدەست هێنانى سەركەوتن و، بەشدارى كردنى جەنگى پيرۆز. هيچ ڕێگەيەكى سەركەوتن نييە ئەگەر قوربانى بۆ نەدەيت و، گيان فيدايى دروشمان بێت بۆ ئەوەى زياتر بەهێزو خۆڕاگر و، بەتوانا و،

ئارامگربین و، بە ئیمانێکی قوڵەوە جەنگی پیرۆز لەبەرژەوەندی خۆمان یەکلایی بکەینەوە.

لەم ڕۆژانەدا سەردەم سەردەمی پیاوەتی و، ئازایەتی و، جوامێرییە، بۆ ئەوەی خۆمان ئامادە بکەین بۆ جەنگی یەکلایی کەرەوە و، هەمومان گیان فیدایی بکەین لە پێناوی گەل‌و نەتەوەکەمان.

بەرنامەی ئاراستەکردنی مەعنەوی کاردەکات لەسەر زیاتر ڕۆچونی ئیمان لە ناخی هەموو سەربازو ئەفسەرەکاندا بۆ دڵسۆزی بەرامبەر بە نیشتمان و، ئامانجە باڵاکانیان، ئەم ئامانجانەش لەژێر ڕۆشنایی یاسا و، ڕێساو شەریعەت و، داننانی نێو دەوڵەتی بۆ ئازادکردنی خاک‌و دورخستنەوەی خراپە و، بڕینی دەستی داگیرکاری لەسەر وڵات.

## دەرکەوتنی دەورنزانی سەربازی:

لە ماوەی جەنگی جیهانی یەکەمدا دەروونناسی وەك لقێکی سەرەکی زانستی دەروونناسی دەرکەوتن، لە ناو سوپاس ئەمەریکادا چەند لیژنەیەکی گەورە دەستیان کرد بۆ پیادەکردنی چەند بنەمایەکی دەروونناسی بەسەر سوپاکەوە، ئەم لیژنانە

<u>**ليواى يەكى پاراستنى سلێمانى**</u>

**هەستان بە گەڕان و، پشكنين لەسەر چەند بابەتێكى گرنگى وەك: دەسنيشان كردنى ڕێژەى زيرەكى و، تواناى سەربازەكان و، ئاستى خزمەتكردنيان بۆ سەربازى و، دابەشكردنيان بۆ سەر كارەكانيان، ئەم توێژينەوانە لايەنى فيسۆلۆجيشى گرتەوە وەك بەكارهێنانى گوێ و، چاو و، هەروەها بوارى بەرنامەى فێركارى و، ڕاهێنان و، بەرزكردنەوەى ئاستى مەعنەوى بەرەنگاربونەوەى جەنگى دەروونى، دواى جەنگى جيهانى يەكەم ولاّتان دەستيان كرد بە گرنگى دان بە دەروونناسى، بەتايبەت ئەڵمانيا، دواى ئەوەى ئەڵمانيا بە شكست لە جەنگى جيهانى يەكەم هاتە دەرەوە دەستيكرد بە توێژينەوە لەسەر هۆكارى شكستەكەى و، گەلى ئەڵمان و، دەستيان كرد بە خۆسازدان و، ئامادەسازى دەروونى بۆ جەنگ، بە مەبەستى تۆڵە سەندنەوە لە نەيارىانيان، توێژەرە دەروونناسەكان بڕياردياندا بە توێژينەوەى دەروونى و، بەرزكردنەوەى گيانى مەعنەوى و، سايكۆلۆژياى جەنگ و، بانگەشەى جەنگى.**

**بۆيە دەروونناسى سەربازيش دواى ئەم قۆناغە هەنگاوێكى گەورەى نا لەناو سوپاى ئەمەريكاشدا، هەرچەند دواتر توێژەران گەڕانەوە بۆ ناو زانكۆكانيان.**

## دەروونناسی لە بواری سەربازیدا :

دەروونناسی ئەركێكی گرنگە لە ناو هێزە چەكدارەكاندا، ئەویش بەهۆی فرە كارییە و، فرەچەنشنی یەكە سەربازییەكان، وەك چۆن لە هەموو دامەزراوەیەك كرێكارەكان كارەكانیان جیاواز و، فرە چەشنە بواری سەربازیش وەهایە، بۆ نمونە هێزی پیادە جیاوازە لە كەتیبەی دورهاوێژ، یان هێزی تایبەت پیشەكەی جیاوازە لە هێزی دەریایی یان ئاسمانی... هتد، ئەویش بەپێی توانا و، لێوەشاوەیی ڕشتەیەك لەو ڕشتانە، تەنانەت جاری وا هەیە یەك ڕشتە (صنف)ن، بەڵام كارەكانیان جیاواز و، فرە ڕەنگە، بۆیە ئەم جیاوازییەش پێویستی بە توانای جیاواز و، تایبەت هەیە.

ئەمڕۆ دامەزراوە سەربازییەكان، پێویستیان بە ئەزمونی دەروونناسە گەورەكان و، پزیشكان هەیە بۆ بواری سەربازی:

١- بەشداریكردن لە داڕشتنەوەی باشترین هۆكار بۆ پلاندانان و، ئامادەكردنی سەربازەكان.

٢- هەوڵدان بۆ داڕشتنەی هۆكاری جەنگ و، ئامادەكاری ئامێری ئەندازیاری مرۆیی نویێ.

**٣- ئامادەکاری بۆ باشترین بارودۆخ، کە هاوکاری بەرزکردنەوەی گیانی مەعنەوی سەرباز و، هاوڵاتی ئاساییش هەبێت.**

**٤- جیاکردنەوەی سەربازەکان و، دابەشکردنیان بەسەر یەکەکاندا بە گوێرەی داواکاریەکانی یەکە و، توان و، ئامادەیی و، ژیری و، عەقڵی و، دەرون دروستی سەربازەکە.**

**٥- بەشداری کردن لەچارەسەر کردنی کێشە دەروونی و، کۆمەڵایەتییەکانی سەربازەکان.**

**٦- توێژینەوە لەسەر ڕەوشتی کۆمەڵایەتی تاکەکان لە ناو یەکە سەربازییەکاندا.**

**٧- توێژینەوە لەسەر باشترین هۆکار بۆ ئەوەی سەرباز باشترین و، نوێترین ڕەوشتی سەربازی فێربێت، کە پێویستە هەموو سەربازێك لە ناو یەکەکەی پیادەی بکات.**

**٨- توێژینەوە لەسەر باشترین خۆ گونجاندن بۆ سەربازەکان لە میانەی گواستنەوەیان لە ژیانی مەدەنی بۆ ژیانی سەربازی.**

**٩- گرنگی دان بە توێژینەوە لە بواری فەرماندەییدا و، بەرزکردنەوەی بۆ ئەوەی لە بواری سەربازی بەکاری بهێنێن.**

١٠- توێژینەوە لە سەر جەنگی دەروونی و، خوێندنەوەی سەرجەم بانگەشە ناڕاست و، بڵاو کردن دەنگۆی ناڕەواکان، ئەمەش لە میانەی شیکردنەوە و، خوێندنەوە بۆ قەبارەی ئەو بانگەشەیە، لە میانەی ئامادە سازی بۆ دەروون دروستی سەرباز.

١١- توێژینەوە لەسەر ئەو نەخۆشیانەی بەهۆی بارودۆخی نالەبارەوە توشی دەبێت.

١٢- بەکارهێنان و، هۆکارەکانی پێوانەیی بۆ دامەزراندنی هەندێك کەس بۆ ئەرکی تایبەتی.

١٣- گرنگی دان بە کێشە سایکۆلۆژییە تایبەتەکان بە بەکارهێنانی هەستەکان، بەتایبەت چاو و، گوێ لە مەیدانی جەنگ.

١٤- کێشە دەروونییەکانی تایبەت بە فڕۆکەوانی و، تاقیکردنەوەی فرۆکەوانی.

١٥- ئامادەکردنی سەرباز بۆ ژیانی مەدەنی دوای تەواو بونی جەنگ، یان خانەنیشن بون لەبواری سەربازیدا.

بۆیە دەروونناسی گرنگییەکی زۆر پێویستی هەیە لە بواری سەربازیدا، بەتایبەت لە کاتی جەنگدا، چونکە لە هەموو

کایەکانی جەنگدا پێویستییەکی تەواوت بە دەروونناسی هەیە، لە بواری گیانی مەعنەوی لەکاتی هێرش و، بەرگری و، کاریگەری دەروونی کە بەهۆی جەنگەوە لەسەر کەسایەتی جەنگاوەر و، خەڵکی مەدەنی دروست دەبێت، خوێندنەوە لە هۆکارەکانی هەڵهاتن لە خزمەتی سەربازی بەتایبەت لەکاتی جەنگ و، سەرجەم ئەو کایانەی دامەزراوە سەربازییەکان داوایان لێ دەکات.

## بابەتەکانی دەروونناسی سەربازی:

دەروونناسی سەربازی پێکهاتەیەکی سەرەکی زانیاریی بەرفراوانی هەیە، ئەم پێگە زانیارییە دەتوانین بەم شێوەیە دابەشی بکەین:

١- هەڵبژاردنی پیشەیی بۆ هەموو پسپۆڕییە سەربازییە گرنگەکان، ئەم هەڵبژاردنە پیشەییەش لەسەر ئەوە بونیات دەنرێت کە باشترین و، ناوازەترین کەس لە ناو سەربازەکاندا دەست نیشان بکەیت بۆ ئەرکی تایبەتی، بۆ نمونە: ئەو کەسەی کاری نۆرین دەکات پێویستی بە لێوەشاوەییەکی زۆر گەورە و، بەتوانا هەیە، دەبێت ئاستی تواناو لێوەشاوەیی لەوانی دیکە جیاوازتربێت و، زیاتر هەستیار و، وریاتر و، وردتر بێت، پەی بە هەموو ڕوداوەکان ببا.

**٢- ڕاهێنانی پیشەیی: پرسەیەکی فێربون و، فێرکردنە، بۆ تاکەکانی هێزە چەکدارەکان بە تەواوی پلە و، پایە سەربازییەکان، بۆیە ئەم ڕاهێنانە بنەماو یاسای تایبەتی بەخۆی هەیە، بە شێوەیەك ئەم ڕاهێنانە تا ئاستێکی باش ببێتە هۆی بەرزبونەوەی ئاستی جەنگی لە ناو تاکەکاندا.**

**٣- هۆکارە فیزیاییەکان و، کاریگەری لەسەر جوڵەی سەربازەکان لەکاتی جەنگەکاندا، ئەو هۆکارانەش زۆرن، وەك: گەرما، سەرما، شێ، تەم و، مژ و، گۆڕەپانی جەنگی و، بەرزی و، نزمی، ئەم هۆکارانەش کاریگەری لەسەر بەڕێوە چونی کارەکانی سەربازییەکان دروستدەکات، هەموو کەسێکی سەرباز بەتەواوی ئەمانە لەبەرچاو دەگرێت.**

**٤- فەرماندەیی و، کاریگەری لەسەر سەربازەکان و، ڕۆڵی گرنگی فەرماندە سەربازییەکان، بەرامبەر پیادەکردنی ئەرکەکانی لەمەیدانی جەنگ و، ئاشتی دا.**

**٥- شوێنەواری نەتەوایەتی و، کاریگەری لەسەر هێزە چەکدارەکان، چونکە هەموو تاکێکی ئەو سوپایە بەشێکی دانەبڕاو و، لێکجیانەبوەوەن لە یەك گەل و، نەتەوە، هەموو باشە و، خراپەکان بۆ ئەو نەتەوە دەگەڕێتەوە.**

٦- کەسێتی سەربازی ئەو تایبەت مەندیانەی کە پێی دەناسرێتەوە و، کاریگەر لەسەر ڕەوشت و، هاوکاری و، کێبەرکێ و، ململانێ دەکات.

٧- گیانی مەعنەوەی ڕوداوێکی دەروونیی سەربازییە، بە ورەبەزری و، خۆنەویستی و، متمانە بەخۆ بون و، متمانە بە فەرماندەییەکەی دەناسرێتەوە، پێویستە پارێزگاری لەم گیانی مەعنەوییە بکەین بۆ ئەوەی هەمیشە لە ئاستێکی بەرزدا بێت.

٨- پەستانی دەروونی لە ژیانی سەربازیدا، چونکە ژیانی سەربازی پڕیەتی لە تەنگژی و، ناخۆشی، ئەم پەستانانە بەردەوام کەڵەکە دەبن، بەتایبەت کاتی جەنگ.

٩- جەنگی دەروونی ئەویش پیادەکردنی کارێکی دەروونییە بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی مەعنەوی تاکەکانی نەتەوە، بەکارهێنانی ژمارەکی زۆر لە هۆکارەکانی ڕاگەیاندن، بەتایبەت دەنگۆ و، هەواڵی ناڕاست، بەشێوەیەك ئەم کارە وابکات: کەسێك بڕوای تەواو بەبابەتێك بگۆڕێت بۆ گومان و، دوودڵی بەرامبەر ئەو گومانە.

## لیوای یەکی پاراستنی سلێمانی

١٠- دیلی جەنگ و، کاریگەرییە دەروونییەکانی، بەتایبەت کاتێك دەکەوێتە دەستی دوژمن، شێوازی مامەڵەکردنی ئەو دیلانەی دوژمن دەکەونە بەردەستتان.

١١- ئامادەکردنی کەم ئەندامانی جەنگ، کە هەندێك تاکەکانی هێزەچەکدارەکان توشی دەبن و، بۆ گەڕاندنەوەی کەم ئەندام بۆ پێش کەم ئەندام بونی و، ئامادەکردنی بۆ دەست کردنەوەی بە ژیانێکی ئاسایی خۆی.

١٢- ڕۆڵی ئافرەت لەناو هێزە چەکدارەکاندا، زۆر لە وڵاتانی جیهان ڕێگەیان داوە بە بەشداری ئافرەت لە ناو هێزە چەکدارەکاندا، بەتایبەت بۆ بابەتی برین پێچی و، هەندێك کاری دیکەی تایبەت بە ئافرەتان.

## ئامانجەکانی دەروونناسی سەربازی:

١- ئامادەکردنی کادیری پسپۆڕ لە بوارە جیاجیاکانی سەربازیدا، بەهۆی پێویستی زۆر بە دەروونناسی.

٢- ئەنجام دانی توێژینەوە و، خوێندنەوەی دەروونی تایبەت بە بوارەکانی سەربازی.

٣- بڵاو کردنەوەی ڕۆشنبیری و، زانیاری دەروونی لە ناو خوێندکارەکانی کۆلێژی سەربازی و، پۆلیس دا، بەتایبەت لە بواری سەربازیدا.

٤- تێگەشتن لە چەمکی دەروونناسی سەربازی و، گەشەکردنی ئەو گۆڕانکارانەی پیادا تێپەڕیوە.

٥- وەرگێڕانی بابەتە تیۆریاکان بۆ پیادەکرنی لە بواری سەربایدا.

٦- بەکارهێنانی هۆکاری دەروونناسی لە هەڵبژاردن و، پێوانە و، ڕێگەی ئەزمونکردن و، بەکاربردنی لە بوارە سەربازییەکاندا.

٧- تێگەشتن لە پەیوەندییە مرۆییەکان و، خوێندنەوەی کەسایەتی سەرباز و، فەرماندە و، جەنگی دەروونی.

٨- لەسەر بنەمایەکی دەروونی ڕەچاوی بارو دۆخی خاوەن پێداویستی تایبەت بکرێت و، ئامادەی بکات و، هاوکاری کردنی دیلی جەنگی.

٩- شارەزای لەسەر ئەو نەخۆشیە دەروونیانە کە بەهۆی جەنگەوە توشت دەبێت.

١٠- سود وەرگرتن لە عەقڵی باڵا (پاراسایکۆلۆجی) لە گۆڕەپانی جەنگدا.

## گرنگی دەروونناسی سەربازی:

دەروونناسی سەربازی گرنگە بۆ گەشە کردنی هێز لە ململانێ سەربازییەکاندا. جەنگ ئەوە نییە کە لە ناو دوو هێزدا لە گۆڕەپانێکی دیاریکراودا ڕوبدات و، دوربن لە ناوچەی نیشتە جێبونی هاوڵاتی، بەڵکو درێژ دەبێتەوە بۆ ناو نەتەوە بەگشتی. ئەوکاتە هیچ جیاوازی لە نێوان جەنگاوەر و، خەڵکی مەدەنیدا نییە، هیچ جیاوازییەك نامێنێتەوە لە نێوان گۆڕەپانی جەنگ و، کۆڵانەکاندا. بۆیە هەموو نەتەوەیەك پێویستی بە پاڵپشتی مەعنەوەی هەیە بۆ بەردەوامبونی و، وەستانەوە لە پشتی جەنگاوەرانی لە ڕویەکی و، وەستانەوە بەرامبەر هەموو کارگەریەکانی دوژمن لە لایەکی دیکەوە.

<u>لیوای یەکی پاراستنی سلێمانی</u>

هۆکارەکانی جەنگ لە خۆیدا زۆر دەبن و، گەشە دەکەنو هەمویان دەبنە یەك سەرباز، پێشمەرگە بەهۆی توانا جەنگییەکانیانەوە زانیارییەکی ورد وەردەگرن. چونکە سەرباز بەتەنها نییە لە ناو گۆڕەپانی جەنگدا. بەڵکو سەرجەم پسپۆڕییەکان هاوڕێیەتی دەکات و، لەگەڵی دەجەنگێت، (یەك سەرباز کۆمەڵێکی زۆر هاوکاری دەکەن) بۆیە بەم شێوەیە سەربازی قوبتاخانەیەکە هەموان لە هەموو ئاستی ڕۆشنبیری وکۆمەڵایەتی ودەروونی خزمەتی دەکەن، هەر یەکەیان بەشێکی گەورەی هەیە لە سەرکەوتنی جەنگدا.

بۆیە ئەتوانم ئەوە بڵێم کە سوپاکان پێویستیان بە سەرجەم بوارەکانی دەروونناسی و، بەشەکانی هەیە بۆ ئەوەی خزمەتی پێبکەن، واژەی (دەروونناسی لە ناو هێزە چەکدارەکاندا) وردترە لە (دەروونناسی سەربازی).

هەروەها نوسین و، کارکردن لەم بوارەدا چەند ڕەهەندی هەیە، واتە نوسین لە دەروونناسی سەربازیو، دەروونناسی هونەری جەنگی.

دەروونناسی لە ناو هێزە چەکدارەکاندا زۆر کۆنە، لە سەدەی پێشوودا ئەوکاتەی کە وەك ئێستا چەکی پێشکەوتو نەبوو، پرسیار لە وەزیری جەنگی سوپایەك کرابوو لەسەر پەسن و،

تايبەت مەندييەكانى فەرماندە؟ وتبوى: پێويستە سەرەتا سەربازەكان پێك بهێنێت، دواتر فەسيلێك دروستبكات، پاشان كەتيبەيەك دروست بكات، بەم شێوەيە... ئەمە بەر لەوەى سوپاكە بجوڵێت و، كۆ ببنەوە.

بەهۆى پەيدابونى چەكى نوێ و، سەردەميانەوە و، جەنگە يەك لەدواى يەكەكان و، ئاڵۆزى و، قەيرانە سەربازييە و، پەيدابونى ئامێرى هاوچەرخ، وايكردوە كە زانايانى دەروونناسى زياتر گرنگى بە دەروونناسى سەربازى بدەن و، دابەشيان بكەن بۆ پيادەكردنى ئەركى جياواز، سەرەتاش توێژينەوە سايكۆلۆژييەكان لە ئەڵمانيا و، فەرەنسا و، ئيتاڵيا و، وڵاتە يەكگرتوەكانى ئەمەريكا و، بەريتانا دەستيان بەكاركردن كرد، هەندێك توێژينەوەيان خستە بوارى سەربازييەوەو ئەركى سەربازەكانيان بە پێى تواناى خۆيان دابەشكرد، تەنانەت لە وڵاتە يەكگرتوكانى ئەمەريكا حەڤدە ليژنە دروستكرا بۆ توێژينەوەى دەروونناسى سەربازى، كە ئەنجومەنى نەتەوەيى بۆ توێژينەوە لە ماوەى جەنگى جيهانى دووەمدا سەرپەرشتى دەكردن.

دواى كۆتايى هاتنى جەنگى جيهانى يەكەم (١٩١٨ز) دەروونناسى لە ناو سوپاكاندا هەنگاوێكى باشى نا و، بەرەو

پێشەوە ڕۆشت، بەڵام توێژینەوەی دەروونی بە کۆتایی هاتنی جەنگ ئەویش وەستا، دەروونناسەکان گەڕانەوە بۆ ناو زانکۆکانی خۆیان، یەکێك لە دەروونناسە ڕۆژ هەڵاتییەکان وتی: "مەترسی جەنگ لەو ساڵانەی کە جەنگی تیانییە توانای ئەوەمان پێدەدات، زیاتر ئەفسەری شیاو و، خاوەن توانانی دەروونی بەرهەم بهێنین بۆ ئەوەی بەرگەی هەموو ئەزمەو قەیرانێك بگرێت، لەکاتی کۆنترۆڵکردنی قەیرانییەکەم خۆی ئامادە بکات بۆ قەیرانی دووەم، بەم شێوەیە ئەتوانین نەتەوەیەکی وەها بەرهەم بهێنین خاوەنی دەروونێکی مەزنبێت، چونکە دەروون دروستی گەورەترە لە بەهێزترین و، بە تواناترین چەك. چوکە کۆششەکانمان نرخەکەی هەرچەند بێت، ئەوە دەستکەوت و، بەرهەمەکەی زیارت و، مەزنترە".

ئەم پێشبینیەش سەرکەوتوو بوو کاتێك ئەڵمانییە نازییەکان پەنایان بردە بەر گرنگی دان بە زانستی دەروونناسی سەربازی و، وەك بەشێك لە پلانی خۆسازدانی دەروونی بۆ جەنگ دایان نا، بۆیە توێژەران دەسیان کردە توێژینەوە لەسەر دیاردە دەروونیی و، کۆمەڵایەتییەکان بەتایبەت ئەوەی پەیوەندی بە هونەری (جەنگ و، سیاسەت و، سەربازیی) و، گیانی مەعنەوەی و، سایکۆلۆجی و، جەنگەوە هەیە. هەر لقێك لە لقەکانی هێزە چەکدارەکان بەشێکیان وەك توێژەری دەروونی تیا دامەزراند،

## ليواى يەكى پاراستنى سلێمانى

هەموو ئەم بەشانە لەژێر فەرماندەیی بەڕێوەبەرێتی گشتی کاروباری دەروونی ئەڵمانیابوو.

ئەڵمانیا بۆ هەستانەوەی سوپایەکی بەهێز دەستیگرت بە زانستی دەروونناسییەوە بۆ ئەنجام دانی ئەو کارە گرنگە. لە لای نازییەکان گرنگییەکی زۆریان دا بە دەروونناسی سەربازی، بۆیە کۆمەڵێك توێژەری ئەڵمانی دەستیان کرد بە توێژینەووەی قوڵ لەسەر دیاردە دەروونییەکانی کۆمەڵگە، بەتایبەت ئەوانەی گرنگی بە هونەری فەرماندەیی و، سەربازی و، گیانی مەعنەوەیەتی لە ناو خەڵکی مەدەنی وسەربازی و، سیاکۆلۆجیای جەنگ و، ڕووبەڕو بونەوەی بانگەشەکان.

لەکاتێکدا لەلایەن بەریتانیا و، وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکاوە کەمتر گرنگی بەم بوارە دەدرا، ئەڵمانیا توانی بەهۆی سود وەرگرتن لە دەرنناسی، بە شێوەیەکی فراوان قەڵغانێکی گەورە لەناو هێزەچەکدارەکاندا دروستبکات، لە هەر لقێکی ئەم سوپایەدا بەشێکی دانابو بۆ خزمەتی دەروون و، ئەم توێژینەوە دەروونیانە لەناو هەموو سوپادا بە چڕی بڵاو بویەوە، سەرجەم ئەم بەشانەش لە ژێر سایەی بەڕێوەبەرێتی گشتی کاروباری سایکۆلۆجی ئەڵمانیا بوو، دەزگایەگەش گرنگی بەم بەشانەی خوارەوە دەدا:

**لیوای یەکی پاراستنی سلێمانی**

١- بژاردە دەروونییەکان بۆ بەرز بونەوەی قوربانیدان و، بەرەنگاربونەوە.

٢-گیانی مەعنەوی بەرگی، کە گرنگی بە رۆحی مەعنەوی سەرباز و، خەڵکی مەدەنیی ئەڵمانیا دەدا.

٣- گیانی مەعنەوی هێرشکردن، پەیوەندی بە کاریگەری گیانی مەعنەوی دوژمن و، کاریگەرکردن لەسەر دەبەست.

ئەم توێژینەوانە چەندین بابەتی لەخۆی گرت کە خستیانە بواری خزمەتی دەروونی سەربازی.

## بەهاکانی ژیانی سەربازی:

لە هەندێك ڕووەوە ژیانی سەربازی زۆر جیاوازە لە ژیانی مەدەنی، هەندێك سروشتی تایبە بەخۆی هەیە، چونکە ژیانی سەربازی هەندێك پابەندبون و، پەرۆشی و، گوێڕایەڵی و، پیادەکردنی خێرای فەرمانەکانی تایبەت بەخۆی هەیە، هەروەها بەرپرسیارێتی زۆر و، سنورداری مامەڵەی خودی تیایە. سەرجەم کارەکانی ژیانی سەربازی لەسەر بنەمای پلەبەندی دەڕوات بەڕێوە.

ژیانی سەربازی بە وریایی و، شیاوی و، هۆشیاریە جیا دەکرێتەوە، بۆیە پێویستی بە شێوەیەك لەشێوەکانی پابەندبون و، زبری هەیە، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە لایەنی ڕۆشنبیری پشتگوێ بخرێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە، بۆ ئەوەی سوپا بەرەو پێشەوە بڕوات پێویستی بەشارەزایی و، ڕۆشنبیری هەیە لە ناو تاکەکانی سوپاکەدا، بۆ ئەوەی هەموو تاکێك بەرپرسیارێتی نەتەوەیی و، نیشتمانی خۆی بزانێت، بە ڕۆشنبیریە زانستی و، شارەزاییەکەی خزمەتی بکات، بۆ ئەوەی بە ئەندازەی شارەزایی خۆی خزمەت بکات، بۆ ئەوەی بگاتە بەرزترین ئاستی گەشەکردن و، پێشکەوتنی سەربازی.

دامەزراوەی سەربازی بەرپرسە بەرامبەر گەشە پێدان و، پیادەکردنی مەشق و، هونەری جەنگ و، بەکار هێنانی چەك و، ئامێرە سەربازییەکان، بۆ سەربازەکانی، ئاراستەکردنی مەعنەوی و، هۆشیاری جەنگی، بەئامانجی ئامادەسازی بەرگری کردن و، ڕەوشتی جەنگی، ئەمانەش پەیوەندییە بە دامەزراوەی سەربازییەوە هەیە کە کاری بنچینەی ئەو دامەزراوەیە.

هۆکاری پیشەیی دیکە هەیە کە بەشێکی بنچینەیی ژیانی سەربازییە، دەروونناسانی سەربازی و، دەروونناسانی کۆمەڵایەتی ئامانجیان یەکە، هەردووکیان بۆ بەدەست هێنانی

ئەو بنەما و، ئامانجە کۆشش دەکەن، بۆیە پێویستە هەموان کار بکەین لەسەر ئەوەی یەك ئامانج بەدەست بهێنین، نە کەمتەرخەمی و، نە زیادەڕۆیی تیا بکرێت، نابێت هەرگیز پاشە کشە نەکرێت لە ئامانجەکەتدا، لەم بوارەدا، زانای دەروونناس (وارین) پێی وایە: "سەرکەوتنی پیشەیی لەکاتی پابەندبونی خود و، کارکردن بۆ ڕێکخستنی دێتەدیی، کارکردن لەسەر ئەم دوو چەمکە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا پێویستی بە شیاوێتی لە تاکدا هەیە بۆ ئەوەی بەبەرزترین شێوە پیادەی بکات". وارین پێی وایە: کە هەموو کاریگەرە ئەرێنییەکان کار لەسەر کەسێتی دەکەن، ئامادەکاری کەسێتی و، ویژدانی لەتوانایدایە کە ویستی خۆ ڕاگری و، بەرخودان لە مرۆڤدا بەدی بهێنێت هاوکاری تاکەکان دەکات بۆ هەماهەنگی و، پێکەوە گونجان و، پێشکەش کردنی کاری شیاو و، سەرکەوتو، بەرهەمی زیاد و، دۆزینەوەی ڕێگە چارەی دەربازبون بەبێ ئاڵۆزی و، سستی و، کەوتن.

## تایبەتمەندییەکانی کەسێتی سەربازی:

کرۆکی کەسێتی سەرباز خۆی لە ڕێزگرتنی خود و، متمانە بەخۆ بون و، بڕوابون بە پیرۆزی پەیامی نیشتیمانەکەی خۆی دەبینێتەوە، ئەو پەسنە بەرز و، بەنرخانەی کە پێویستە کەسی سەرباز پیادەی بکات و، لە خۆیدا کۆی بکاتەوە بۆ ئەوەی بگاتە

**بەرزترین ئاستی ڕۆشنبیری ونمونەی باڵا، بریتین لە: دانایی، ئازایەتی، ڕەوشتبەرزی، ئارامگری، ئیرادەی، دادگەری، جوامێری، شکۆمەندی، ژیری، هەستی دروست، بەئاگایی، گیان فیدایی، لە هەموو سەربازێك هەبێت، پێویستە سەرباز ئەو هەستەی لا دروست ببێت کە نیشتمانەکەی هۆزەکەیەتی، یان خێزانەکەیەتی، یان ئەو ژینگە گەورەیە کە تیایدا دەژی، وەك خێزانێك سەیری ئەندام و، هاوپیشەکانی بکات.**

**کۆمەڵگەی دروست و، سەرکەوتوو ئەو کۆمەڵگەیە لەسەر بنچینەیەکی جێگیر هەیکەلی وڵاتەکەی دارشتووە، پیاوێکی شیاو و، گونجاو و، لێوەشاوە و، ورە بەرز نەخشە کێشی کردووە، بۆ ئەوەی بەرگەی هەموو ئەو بەربەستانە ببێتەوە دێنە بەرەمی بە ئاسای بگاتە ئامانجەکەی.**

**دەربارەی گیانی مەعنەوی و، گوزارشتەکانی لە کاراکردنەوەی کەسەکاندا، دەروونناسی سەربازی پشتی بەزنجیرەیەك بژاردە بەستووە کە ئەتوانی لەژێر سایەیدا هەیکەلی کەسێتییەکی ناوازەی سەرازێکی تیا بنەخشێنیت، چونکە ژیانی سەربازی کۆمەڵێك بەهرە و، توانا و، ئازایەتی و، ژیانێکی قورست فێردەکات، بۆ ئەوەی ئامادەت بکات بۆ قوربانی دان و، خۆ نەویستی، بۆیە دەروونناسان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە**

کە پێویستە سەرباز گیانێکی مەعنەوی بەرزی هەبێت و، خاوەنی ورەیەکی پۆڵاین بێت، چونکە ئەم هەستە وادەکات متمانە بە کۆمەڵەکەی بدات و، تاکێك ڕۆڵی بەرچاو دەبینێت لە ناو کۆمەڵێکدا.

## تایبەت مەندییەکانی دامەزراوەی سەربازی:

ڕێکخراوی سەربازی بە چەند تایبەت مەندییەك لە دامەزراوەکانی دیکە جیادەکرێتەوە، لەوانە:

أ- پێویستە هەموان بەشێوەیەکی نیمچە گشتی گوێڕایەڵی بن.

ب- جیاکارییەکی فەرمی تەواو لە نێوان سەرجەم پلەکاندا. بەشێوەیەك ئەو جیاوازیانە بەوردی دیاری کراون بۆ ئەوەی گوێڕایەڵی زیاتر پەیدا ببێت لە کاتی ئەرك و، ماف و، فەرمانەکانیان.

ت- هەمیشە نەریتە سەربازییەکان جیاوازە لە نەریتی مەدەنی، بۆیە کەسی سەرباز ناتوانێت بە پێی ویست و، سروشتی خۆی کارەکان ئەنجام بدا، پێویستە جۆرێك لە ڕەوشتی سەربازی پێوەدیاربێت.

## ئەو کارانەی کە دەروونناسی لە ناو هێزە چەکدارکاندا ئەنجامی دەدات:

## ليواى يەكى پاراستنى سليمانى

دەروونناسى سەربازى لە چەندين بواردا بەكار دەهێنرێت، سەرەتا لە هەڵبژاردن و، ديارى كردنى تاكەكان و، ڕاهێنان دەست پێدەكات تا دەگاتە سەرجەم بوارەكانى ديكەى پڕۆسەى دەروونناسى، وەك:

أ- هەڵبژاردن و، پۆلێن كردنى تاكەكان: ئەم ئەركەش بۆ هەڵبژاردن و، دەست نيشان كردنى كەسى شياو و، پسپۆڕە بۆ جێگەى خۆى، واتە كەسێكى باش و، گونجاو پارێزەرى نهێنييەكان بێت، بەتايبەت ئەو نهێنيانەى مەترسى ئاسايشى دروست دەكەن.

يان هەنديێك كەس شاوترن بۆ ئەوەى ژمارەى نهێنى و، كۆدى مەترسيداريان بدرێتە دەست، ئێستا زۆر لە سوپاكان پشكنينى پزيشكى ئەنجام دەدەن، كەئەمەش خۆى بۆخۆى كارێكى گرنگ و، پێويستە، واتە هيچ سوپايەك نييە پێويستى بە دەروونناسى و، پسپۆڕى درەونزانى نەبێت، كارەكانى دەروونناسانيش لەم خالأنەى خوارەوە خۆيان دەبيننەوە:

يەكەم هەڵبژاردن: دەست نيشان كردن كەسێك يان دوو كەس لە ناو كۆمەڵێك كەسى پێشكەوتودا، بەتايبەت ئەوانەى كە هيوات پێيان هەيە لەناو ئەو كەسانەى هەڵتبژاردوون، بۆ پيادەكردنى:

١- هەندێك مەبەستى نوێ ودياري كراو جێبەجێكردنى ئەو كارانە.

٢- بە باشى ئەنجامدانى داواكاريەكەت.

٣- هەڵسەنگاند و، تاقيكردنەوەى تاكەكان بۆ هەستان بەوكارانەى پێت سپاردوون.

دووەم شيكارى كارەكە: پێكدێت لەوەى كە يەكەم كارى هەڵبژاردنى ئەو كەسانەى دەست نيشانت كردون، كارێكيان پێ دەسپێريت بۆ ئەوەى بزانيت چۆن ئەو كارەى ئەنجام داوە و، بيكەيتە پێوانە بۆ ئاستى سەركەوتنى. بۆ ئەوەى تواناو ئامادەكارى ئەو كەسە بزانين كە بە سەرباز يان ئەفسەرەكەى دەسپێرين پێويستە كەسى پسپۆڕ ئەم كارە هەڵسەنگێنێت.

پاشان دەورنناسان پشت دەبەستن بەو ئەنجامەى كە لە شيكاريەكە دەستيان كەوتوە و، بڕيار لەسەر شياوى يان نەشياوى ئەو كەسە دەدەن.

سێيەم تاقيكردنەوە: كاتێك قۆناغى شيكارى كارەكان تەواو دەبێت، دەڕۆن بۆ ناسينى ئەو پێوانانەى كە بەكارهاتوون بۆ زانينى ئاستى شارەزايى ئەفسەر و، سەربازەكە.

تاقیکردنەوەی دەروونی هۆکاری سەرەکییە کە دەروونناسان بۆئەو مەبەستە پیادەی دەکەن.

## ئەو تاقیکردنەوانە :

١- تاقیکردنەوەی ژیری و، زیرەکی و، توانای گشتی عەقڵ.

٢- تاقیکردنەوەی ئامادەسازی گشتی و، تایبەتی.

٣- تاقیکردنەوەی شیاوی و، بەدەست هێنانی تواناکانی.

٤- تاقیکردنەوەی کەسێتی، ئارەز و، ئاراستەکان و، هاوسەنگی کەسێتی و، کاردانەوە و، ئارامگرتن.

ڕوخساری کۆمەڵگەی سەربازی:

بۆ ئەوەی زیاتر وێنەی ڕوکەش و، بنەماکانی دەروونناسی لە ناو کاروباری سەربازی ڕون بکەینەوە، پێویستە ئاماژە بدەین بە گرنگترین دیمەن و، شێوە و، تایبەت مەندییەکانی هێزە چەکدارەکان، کە دیارترینیان ئەمانەن:

١- کۆمەڵگەی سەربازی لەناو هەموو کۆمەڵگەکاندا ژمارەیان زۆرترە.

٢- كۆمەڵگەى سەربازى بۆ چارەسەرى كێشەكان زۆرجار بەكار دەهێنرێت، بەهۆى سروشتى خۆى ئەو كێشانەى كە بە سەربازى يەكلايى دەكرێتەوە زۆربەى جار سەر دەكێشێت بۆ جەنگ و، كوشتار، بەڵام لە هەمان كاتيشدا هۆكارى ئارامى و، سەقام گيرى وڵاتە، زۆر جاريش دەبێتە پەستان و، تەنگژييەك بۆ وڵاتەكەى خۆى.

٣- پەيوەندى نەريتى سەربازى بە ماوەيەك دروست دەبێت و، پاشان ڕۆدەچێت لە ناو كۆمەڵگەدا، بە شێوەيەك چەق بەستوو دەبێت گۆڕان تيايدا ئەستەم دەبێت.

## ژيانى سەربازى:

لە گۆڕەپانى جەنگ و، سەربازيدا تەنها پێويستت بە ئازايەتى نييە، ئەگەر شارەزايى و، تواناى لە بەكار هێنانى چەكدا نەبێت. چەكى ئەمڕۆش زۆر ئاڵۆز و، فرە چەشن و، فرە جۆرە، ئەمەش بارگرانى دروستكردووە، كلاشينكۆڤ ئەمڕۆ جياوازبوو لە كلاشينكۆڤ دوێنى.

فرە چەشنى چەك و، جبەخانە و، كەرەسەتەى جەنگى، بەهۆى هاتە كايەى تەكنەلۆژيان بۆ ناو پێداويستى سەربازى

گەشیتوەتە ئاستێك، بچوكترین ئامێری جەنگی كارەساتی گەورە درەست دەكات.

بەهۆی چەكی ئەتۆمی و، چەگی بایۆلۆجی بەكتریایی و، چەكی كمیاوی، جەنگەكانیش بەرەو ئاراستەیەكی دیكە هەنگاو دەنێن. لە میانەی هەموو ئەوەی وتمان ئەتوانین بلێین: دامەزراوەی سەربازی لەسەر دوو پایەی سەرەكی بونیات نراون (سەرباز و، چەك) چەك بۆخۆی توانای كاركردنی نییە، هەروەها سەربازیش بە بێ چەك ناتوانێت هیچ بكات. تاكەكانیش لە ناوخۆیاندا لەیەك جیاوازن، لە هاوسەگی و، كاردانەوە و، بەباشی بەكار هێنانی چاو و، دەستەكان بەكارهێنانی چەك بۆ هەریەكە لە ئەندامانی ئەو یەكەیە.

بۆیە ژیانی سەربازی پێویستی بە كەسانی خاوەن ئیرادە و، ویستی بەهێزە، چونكە كەسی هاوسەنگ بنەمای هاوسەنگی ژیانی سەربازییە.

## گونجانی پێویست لە ژیانی سەربازیدا:

گومانی تیانییە لەسەرەتا پەیوەندی كردنی هەر تاكێك لە یەكەم ڕۆژ خزمەتییەوە تا كاتی خانە نشینی پێویستی بە ڕاهێنان و، ئامادەسازی بۆ ڕاهێنان هەیە، چوونكە لە هەموو

ڕویەکەوە ژیانی سەربازی جیاوازە لە ژیانی مەدەنی، لەبەر ئەم جیاوازیشە وایکردوە، کە سەرجەم پرۆسە سەربازییەکان پێویستی بە دەروونناسی هەیە، بۆ ئەوەی ئەو کەسەی دیاری دەکات دڵنیابێت لە گونجاوی جەستەیی و، عەقڵی و، دەروونی بۆ ژیانی سەربازی. بەپێی ئەو توانایان کە هەیانە سەربازەکان دابەش بکرێن بەسەر یەکەکاندا.

## ڕۆڵی دەروونناسی لە ژیانی سەربازیدا:

گومانی تیانییە هێزە چەکدارە هاوچەرخەکان پێویستی زۆریان بە دەروونناسی سەربازی هەیە، بەتایبەت گرنگی دان بە ژینگەی سەربازی کە جیاوازترە لەو ژینگەی پێشتر هەیبوو، لەبەر ئەوەی ژیانی سەربازی شێوە و، تایبەت مەندی و، وێنەی تایبەت بەخۆی هەیە، هەرکەس ویستی لێی هەبێت ئەتوانێت چێژی لێ ببینێت، دەروونناسان لەسەر ژیانی سەربازی دەڵێن کێڵکەیەکی دروستە بۆ توێژینەوە و، ئەزمونکردن و، خوێندنەوە لەسەر کەسی سەرباز بۆ پیادەکردنی ئەرکەکانی کە پێی دەسپێردرێت.

مێژوی هاوچەرخ ئاماژە بە دوو تاقیکردنەوە دەدات کە هێزەکانی ئەمەریکا ئەنجامیان داوە:

## لیوای یەکی پاراستنی سلێمانی

أ- تاقیکردنەوەی (ئەلفا)ی سوپا.

ب- تاقیکردنەوەی (بیتا)ی سوپای ئەمەریکی.

ئەمانە دوو تاقی کردنەوەبوون کە بۆ شەن و، کەوکردن و، پاڵفتەکردنی سەربازەکان ئەنجام درا، لەمیانەی ئەوەی کامیان گونجاون بۆ هێزەکانی ئەمەریکا و، بۆ چی جێگەیەك گونجاوە، ئەمەش لە ناوەڕاستی جەنگی یەکەمی جیهانی ساڵی (١٩١٤-١٩١٨) ڕویدا.

پەیوەندی بە سوپاوە پێویستی بە پلەیەك لە ژیری و، زیرەکی هەیە بۆ ئەوەی بگاتە ئاستی ئەوەی بگونجێت بۆ ئەوەی ببێت بە سەرباز یان لە سەربازی بی بەخشیت، هەروەها دابەشکردنیان بۆ پێدانی چالاکییە جۆراو جۆرەکان، بۆ ئەوەی لە ئاستی ئەنجام دانی ئەو کارانەدابێت کە پێویستە هەموو سەربازێك ئەنجامی بدەن.

## ئایندەی دەروونناسی لە ناو هێزە چەکدارەکاندا :

دەروونناسان لەبواری سەربازیدا کۆششێکی زۆریان ئەنجام داوە و، لە ئەنجامدا گەیشتونەتە چەندین دەر ئەنجامی بەسود،

بەڵام زۆربەیان بە شاراوەیی هێشتوەتەوە بۆ ئەوەی دزە نەکاتە ناو خەڵك و، بە نهێنی بمێنێتەوە، نەك هێزە جەنگییەکانی دیکە سودی لیٚ ببینن، زۆرجار مەرج نییە هەمیشە جەنگی جیهانی خراپترین بێت، بۆ نمونە: لە جەنگەکانی نیمچە دورگەی عەرەبی و، بەهاری عەرەبی لە سوریا و، پێشتریش لە عێراق بینیمان زۆر چەکی پێشکەوت و، بگرە قەدەغەکراویش تاقیکرانەوە. بۆیە پێویستە هەمیشە مرۆڤ خۆی ئامادەبکات بۆ جەنگ، بەتایبەت پیاوانی سەربازی و، هێزە چەکدارەکان بۆ ئەوەی ئامانجی داواکراو بە دەست بهێنرێت.

سەرجەم زلهێزان بەو هەموو پێشکەوتنە سەربازی و، مادییە زۆرە پشت بە دەروونناسی دەبەستن، بۆئەوەی زیاتر ئاست و، توانای جەنگاوەران بەرز بکەنەوە، دەروونناسان ئەزمونێکی تایبەتیان هەیە بە سروشتی مرۆڤ، هۆکار و، ڕێگەی تایبەتیان هەیە بۆ هەڵبژاردنی پیاوانی پۆلیس و، ڕاهێنان و، فێربون و، فێرکردن و، گۆڕینی ڕەوشتیان و، لێوەشاوەییان و، توانای مەعنەوییان. ئێستا دەروونناسان لە زۆربەی دەوڵەتە زلهێزەکاندا خەریکی توێژینەوەن لە بواری سەربازیدا، بەتایبەت توێژینەوە لەگەڵ ڕاهێنانی سەرباز لەگەڵ ئەوکەشەی تیایەتی. چونکە ئەو زانیاریانە کە بەدەستی دەهێنن هەرگیز بە پارە مەزەندەناکرێت. بۆ نمونە ئامادە باشی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا لە جەنگی

## ليواى يەكى پاراستنى سلێمانى

جيهانى دووەمدا (١٩٦٢) زانايەكى دەروونناسى هەستا بە پيادەكردنى توێژينەوەيەكى تايبەت لەسەر هێزە چەكدارەكان، هەروەها زانايانى بەريتانى و، ڕوسيش بەشداريان تياكرد. لە كۆتايدا سەرجەم توێژينەوەكان گەيشتنە دەر ئەنجامێك كە خۆى لە چەند خاڵێك دەبينێتەوە:

أ- ڕێكخستنى هۆكارەكانى تاقيكردنەوە و، پاڵاوتن.

ب- شيكارى سەرجەم ئەركەكانى سوپا و، وردەكارى تياياندا.

ت-چاكسازى لە بەرنامەى فێربون و، ڕاهێنانى سەربازى.

ج- توێژينەوەى سايكۆلۆژى پەيوەست بەهەستەكانەوە (بيستن، بينين،... هتد).

ح- چاكسازى لە پيشەسازى چەك، كە بۆ مرۆڤ بگونجێت.

خ- زانينى ويستى سەربازەكان و، ئاواتەكانيان، بۆ ئەوەى لە كاتى ئاراستە كردنياندا سوديان هەبێت.

د- زانين بۆچونى هاونيشتمانيان و، دوژمن سود وەگرتن لە دەنگۆ و، ڕاگەياندراوەكانيان.

## لیوای یەکی پاراستنی سلێمانی

س- بەهێزکردنی لایەنی مەعنەوی گەل و، سەربازەکان.

ش- چارەسەرکردنی ئەوانەی توشی پەشۆکاوی دەروونی بونەتەوە.

# دەروازەی دووەم

# فەرماندەیی و، گەشە پێدانی لە ژیانی سەربازیدا

## پێشەکی

پیادەکردنی فەرماندەیی دیاردەیەکی کۆمەلایتی گشتییە و، تا ڕادەیەکیش ئالۆزە، بۆ ماوەیەکی درێژ دەمێنێتەوە، بەردەوام پیاوانی گەورە دروست دەکات، بۆ ئەوەی زیاتریان دەست بکەوێت زیاتر کۆشش دەکەن و، گەشەی پێدەدەن، دەروونناسان و، پسپۆڕان بەردەوام کار لەسەر ئەوە دەکەن لە زۆربەی لقەکانی ئەکادیمیا و، دامەزراوەکان گەشەی پێ بدەن، زۆر شیکاری و، گۆڕان بەسەر ئەم پرۆسەیەدا هاتووە. بەپێی سەرجەم توێژینەوەکان، زۆترین گۆڕانکاری ئالۆزی تێدا ئەنجام دراوە، چونکە مرۆڤ بەتەواوی بەشداری تیا دەکات و، گۆڕانی ڕیشەیی لە خۆیدا جێبەجێ دەکات، پیاوانی فەرماندەیی بەشێوەیەکی تاك و، کۆمەڵ و، جیاوازی و، هاو جەنگی، تیا دەردەکەوێت، سەرجەمیان کۆشش و، ئالنگاری دەکەن بۆ وەلام دانەوەی ئەو پێویستیانەی دەبێت لە فەرماندەدا هەبێت و، ئامادەیی بۆ دەربڕن. بۆیە بەردەوام ئەم توێژینەوانە لە فراوانبوندان، ئەمەش وایکردوە توێژینەوە لەسەر فەرماندەیی کارێکی تایبەت و،

ناوازەیە و، جێگەی مشتو مڕ و، ئاڵنگارییە. هەمیشە ئەو تیۆریا و، بەرئەنجامانەی دوێنێ پیادە دەکرا بە پێی توێژینەوەکان بۆ سبەی شیاوی گونجاو نییە.

لەبەر ئەوەی تیۆریا گۆڕاوەکان شیاوی پیادەکردنیەتی، پێویستە ئەو شتانەی گرنگن لە بازنەیەکدا کۆ بکرێنەوە بۆ ئەوەی پیادەیان بکەین. کۆکردنەوەی شێوە زارەکی و، تیۆریاو بیرە جیاوازەکان، پێویستیان بە وەیە لە لایەن ڕێبەرێکەوە فێر خوێندکارەکانی بکرێت، پێویستی بەوەیە کە ئەم زانیاریە پیادە بکرێت. ڕێگەی شیکاری بۆ ئەم تیۆریا زانستییە پێویستمان بە سێ کارەکتەری سەرەکی هەیە بۆ ئەوەی کرداری فەرماندەیی پیادە بکەین: فەرماندە، شوێنکەوتەکانی و، جێگە و، ژینگەیەك کە ئەم کارانەی تیا ئەنجام بدات. هەریەکە لەم کارەکتەرانە خۆیان بۆ خۆیان پێویستیان بەوەیە گۆڕانکاریەکانی شیکاری بکرێت و، لە ڕێگەی پیادەکردنی لێکۆڵینەوەی زانستییەوە دیاری دەکرێت.

## پێناسەی فەرماندەیی:

بەپێی تێگەشتنی گشتی کە هەر بوارە و، بەپێی پسپۆڕی خۆی پێناسەی فەرماندەیی کردووە، جیاوازی زۆر هەیە لە پێناسەکانیاندا، بەڵام ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە ئەوەیە کە فەرماندەیی بریتییە لە: هونەری دروستکردنی کاریگەرییە لەسەر تاکەکان. هەرچەند ئەم پێناسەیە کورتە، بەڵام بەڵگەیە لەسەر گشتگیریترین پێناسەکە بۆ هەموو بوارەکانی دیکەش دەگونجێت، بەردەوامی تیایە و، گرنگی و، پێداویستی سەرەکی فەرماندە باس دەکات لەناو کۆمەڵەکانی دیکەدا. هەرچەند ئەم پێناسە بۆ بواری سەربازی زۆر کورتە، چونکە فەرماندەی سەربازی تەنها لەناو یەك کۆمەڵەدا کار ناکات، یان تەنها یەك ئەرکی نییە ئەرکەکانی فرە چەشنن و، فرە ڕەهەندن، باشترین و، گونجاو ترین پێناسە بۆ بواری سەربازی بریتییە لە: هونەری کاریگەری دروستکردن لەسەر ڕەفتاری مرۆڤ، بۆ بەدەست هێنانی ئەو ئەرکەی لە ئەستۆی دادەنرێت بە پێی ئەوەی فەرماندە دەیەوێت.

## فەرماندەیی لە بەڕێوەبردن و، سەرکردایەتی:

## لیوای یەکی پاراستنی سلێمانی

هەر پێناسەیەکی فەرمانده‌یی کاریگەری لەسەر بابەتێکی دیکە دروست دەکات، ئەویش واژەی: بەڕێوەبردن و، سەرکردایەتییە... ئەم دەستەواژانە بۆ بواری سەربازی و، مەدەنی بەکار دەهێنرێت. لای زۆربەی تاکە سەربازییەکان وا دادەنێن سەرۆکایەتی و، فەرماندەیی هاومانان. بەڵام ئەوەی لەم دوو بوارەدا کار دەکەن جیاوازییان دروستکردووە لە نێوان بەڕێوەبەر و، فەرماندە. بەپێی بۆچونی زۆربەی خەڵك لەناو هێزە چەکدارەکان، بە سەرۆکەکەیان دەڵێن فەرماندە، بەڵام لای فەرمانگەکانی دیکە دەوترێت بەڕێوەبەر.

بەڵام بەهۆی ئەوەی لە ناو سەربازیدا یاسایەکی گشتگیرتر پیادە دەکرێت پێی دەوترێت فەرماندە.

پێویستە فەرماندەش بەڕێوەبەرێکی سەرکەوتو بێت، چونکە فەرماندەیی زیاتر تەکنیکەکانی ئیدارە پیادە دەکات. فەرماندەیی دەسەڵاتێکی یاساییە کە فەرماندەکەی بەسەر بەردەستەکانیدا بە پێی پلە و، پۆستەکەی پیادەی دەکات، لەبەر ئەمەیە کە فەرماندە بەڕێوەبەری ڕێگەپێدراوی ئەو یەکەیەیە. ئەم سەرۆکایەتییە تەواوی ئەو خاڵانە پیادە دەکات کە لە فەرماندەدا هەیە، بەڵام سروشتی وەهایە کە پێی بوترێت فەرماندە وەك تاك و، ڕەفتار و، ئەرکەکەی. ئەتوانرێت (نقیب)ێك بکرێتە فەرماندەی

سریە، چونکە ئەم خاوەنی پێگەیەکی یاساییە، بەڵام فەرماندەیی خۆ بۆخۆی ئەو پەسن و، تایبەت مەندیەیە لەو کەسە دەنرێت.

## گرنگی شیکاری بۆ فەرماندەیی:

یەکەم: سەرکەوتن و، شکستی هەر کۆمەڵە و، گروپ و، دامەزراوەیەك لەسەر دەستی فەرماندە و، هۆکارەکانی فەرماندەیی وەستاوە.

دووەم: فەرماندەیی کار دەکات لەسەر دروستکردنی کاریگەری لەسەر ڕەوشت و، ئاراستەکردنی تاکەکان بۆ چالاککردنیان، ئەمەش وادەکات هاوکاریان بکات بۆ بەدەست هێنانی ئامانجەکانیان بەتایبەت لە کاتە هەستیار و، قورسەکاندا.

سێیەم: هەمیشە کۆمەڵگە بەتایبەت کۆمەڵگە تازە گەشەکردوەکان پێویستیان بە فەرماندەیی زۆر باشی بەتوانا هەیە بۆ ڕێکخستنی بەڕێوەبردنی کارەکانیان و، دامەزراوە و، کۆمەڵە فەرمی و، نافەرمییەکان، بۆ ئەوەی کاربکەن بۆ گەشە پێدان و، بەرزبونەوەی ئاستی گەشەکردن و، بەردەوامی پێدانی پێشکەوتنەکەیان.

چوارەم: زانینی ئەو کێشە جۆراو جۆرانەی لەکاتی کارکردندا دێتە ڕێی فەرماندەکان، بەتایبەت لەکاتی ئەنجامدانی چالاکی وچالاککردنی ئەو پەیوەندیەی لە نێوان ژینگەی کارکردن و، ئەو ڕێکخراو و، دامەزراوەیەیە کاری تیا دەکات، یان ئەو کێشانەی کە پەیوەستن بەتاکەکانەوە لەڕوی تەندروستی و، جەستەیی و، دەروونی، پێویستە فەرماندە هەمیشە شارەزایی و، زانیاری تەواوی هەبێت لەسەر تەواوی ئەو کێشە و، ئاریشانەی دێتە ڕێیان و، چارەسەریشیان بۆ بدۆزێتەوە.

پێنجەم: بۆ بەشداری کردن و، لە لەدایکبونی زانیاری نوێ لە ناو دامەزراوەکە و، هۆکارەکانی گەشە کردن و، چالاك کردنی کارەکان، ئەمەش پێویستی بە ڕاهێنیانی جۆراو جۆرە لەلایەن فەرماندەوە.

## پۆلێنکردنی فەرماندە:

دەتوانین فەرماندە بۆ چەند گروپ و، تاقمێکی جیاواز دابەش بکەین. هەر دامەزراوەیەك بە شێوەی خۆی پۆلێنی بکەین، بەڵام پێویستە پۆلێنکردنەکە وەهابێت فەرماندە بنکەی سەرەکی فەرماندەیی بگرێت لەناو کۆمەڵە و، گروپەکەی خۆیدا. لەناو کۆمەڵگەی نافەرمیدا هەمیشە فەرماندە لەخۆوە هەڵدەبەزێتەوە و، دروست دەبێت، چونکە دەورو پشتەکەی

ناچار دەكات دان بە پێگەكەیدا بنێن، بۆ نمونە: ڕەنگە دە منداڵ بیانەوێت بۆ ماوەیەكی كورت یاری تۆپی پێ بكەن، ئەو منداڵانەی كە لە هەمویان بەتواناتر و گەورەترن بیانەوێت باڵادەستی خۆیان نیشان بدەن و، بە ویستی خۆیان تیمی خۆی جیا بكەنەوە و، یاساكانی یارییەكە دابڕێژن.... لەكۆتایدا ئەوە فەرماندەی باڵای دانپێدا نراوە.

بەڵام ڕاستیەكەی ئەوەیە دیاری كردنی سەركردە و، فەرماندەیی پێویستە لەناو كۆمەڵەكەدا بەهۆی دەنگدان و، كەسی شیاو و، دەست نیشان كردنی لێوەشاوەیی ئەو كادیرانە دیاری بكرێن و، دایان بنێن. لە ناو نەتەوەی دیموكراتیدا سەرۆكە سیاسییەكانیش بە هەڵبژاردن دەسەڵات دەگرنە دەست.

ئەتوانین ئاستە گشتییەكانی فەرماندەیی بەچەند تایبەت مەندییەك لەبواری پیشەسازی و، بەڕێوەبەری گشتی و، بەڕێوەبەری بەش و، سەرپەرشتیاری، لە ناو هێزە چەكدارەكاندا جیایان بكەینەوە و، بەم شێوەیە پۆلێنیان بكەین: ئەفسەری باڵا، ئەفسەری مەیدان، ئەفسەری سریە، ئەفسەری پۆل، هەریەكە لەم ئاستانە ئاریشەی تایبەتی ئاراستەیان دەبێتەوە، لەهەمان كاتیشدا لە زۆر ڕووەوە هەریەكەیان لەوی دیكە دەچێت.

## بنچینەكانی خوێنەوە لەسەر فەرماندەیی:

## لیوای یەکی پاراستنی سلێمانی

لە ڕوانگەی مێژووییەوە، زۆربەی هەوڵەکانی ئەم بوارە لەسەر بنەمای (فەلەسەفەی یاسا و، فەلسەفەی ئەخلاق) بونیات بنرێت. لە سەدەی ڕابردودا توانرا سودێکی زۆر لە تیۆریاکانی فەرماندەیی بەدەست بهێنن، لە لایەن (موریس دوساکس و، گومینی و، کلوز دیتزو، ئەدوانت دویك و، کەسانی دیکە).

بەداخەوە زۆربەی ئەو توێژینەوانە کە دەربارەی فەرماندەیین، لەسەر تیۆریای فەرماندەیی زانستیی نییە، کە گومان بڕ و، یەکلاکەرەوە بن، بەڵکو زۆربەیان لەسەر تێبینی و، پێشبینی دانراون، زۆربەشیان گومان لە ڕاستیان هەیە و، ئەزمونێکی کەسێکی ئاساییە. ئەو دوو چەمکە سەرەکییە کە پێویستەفەرماندە لەخۆیدا دروستی بکات: بریتیە لە: (فەلەسەڤ یاسا و، فەلسەفەی ئەخلاق) دواتر بنەمای سێیەمی بۆ زیادکراوە، کە بنەمای: زانستی سەربازی.

### فەلەسەفە:

فەرماندەیی ڕەگ وڕیشەی زۆرقوڵ و، درێژی هەیە، شوێنەواری زۆری بە شوێن خۆیدا جێهێشتووە، لە فەلسەفەی کۆنفۆشیۆسی درێژ بوەتەوە تا فەلسەفەی نوێ، هەریەکە بۆچونی تایبەت بە خۆی هەیە لەسەر فەرماندەیی. تەنانەت هەندێك لەو پەرتوکانەی کۆماری چین کە ماون فەلسەفەی سون

تزو (٥٠٠پ.ن) نوسراوە، باس لە تیۆریای پەیوەندی نێوان فەرماندە و، شوێنکەوتوانی دەکات. هەروەها سوقرات لە (کۆماری ئەفلاتۆن)دا باسی فەرماندەیی دامەزراوە مەدەنییەکانی پاشا و، فەلسەفەی ڕاهێنان و، پێگەیاندنیان دەکات، وا باسیان دەکات کە شوێن کەوتوانیان کەمو کورتیان تیایە بۆ یە پێویستە ئەوان فەرمانڕەوایەتی بکەن و، خەڵکیش شوێنیان بکەوێت، ئەرستۆ تاڵیس بۆچونی لەسەر ئەخلاقیەتی فەرماندەیی جیاوازە، باسی ئەو ڕەوشتانە دەکات کە لە ئەسکەندەری گەورە بەجێماوە. لە توێژینەوەی (بلوتارکدا) لە ڕێگەی توێژینەوە لە ژیانی ناودارانی یۆنان و، ڕۆمان باسی کێشەی نێوان فەرماندە و، شوێنکەوتە دەکات. هەروەها (میکیاڤیلی) لە پەرتوکی میر (امیر)دا باسی دڵڕەقی فەرماندە و، خیانەت و، تەڵەکەبازی فەرماندەکان دەکات.

## یاسای ڕەوشتی:

کۆمەڵێك یاسای ئەخلاقی لەناو چەمکی فەرماندەییدا هەیە. (فابکتیتس و، مارکوس و، ئوریلیوس) توێژینەوە لە بواری بەرپرسیارێتی فەرماندەکان لەئاستی ئەخلاقدا دەکەن، هەروەها باسی ئەو کۆمەڵە ڕەوشتە دەکەن کە لە ژێر فەرمانڕەوایەتی ڕۆمانیدا دروستبووە. دواتر دێنە سەر فێرکارییە ئیسلامی

بەتایبەت ئەو بنەمایانەی باسی شکۆمەندی و، بەهاداری مرۆڤ دەکات و، گرنگی بە مرۆڤبونی بەرامبەر دەدات، کۆمەڵێك بنەما و، ڕەوشتی زۆر باڵای داناوە بۆ ئەوەی لە فەرماندەدا هەبێت بەرامبەر بەردەستەکانی. هەروەها جوامێری بوەتە یەکێك لە ناسنامەکانی دەستوری فەرماندەیی، چونکە فەرماندە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا گرنگی بە جوامێری و، شاسواری و، شکۆمەندی نیشتمانەکەی داوە. ئەم دەستورە تا ئەمڕۆ بەردەوامە و، کاری پێدەکرێت.

## زانست:

تویژینەوەی زانستی بۆ فەرماندەیی جیاوازە لە تویژینەوەی ئەخلاق و، فەلەسەفە لەکاتی شیکاریکردنیاندا. چونکە زانست و، فێربون پڕۆسەیەکە بە ئەزمون کەسەکە لە پێشوی خۆی جیا دەکرێتەوە.

کاتێك پەیوەندی لەگەڵ زانستی شیاو دەبینێت، ئەم زانستە وای لێدەکات کە زیاتر کامڵی بکات لە تێگەیشتن لە ڕاستییەکان و، پێشگریمانەکان، ئەتوانین ناوی بنێین بەتیۆریا یان بنەمای زانستی. زانست بەهۆی بیرکردنەوەی خوێندەوە زیاد دەکات،

چونكە ئەو گريمانەيانە دەگۆڕێت بۆ تيۆريا و، دواتر دەبنە بنەماى سود بەخش.

بۆ ئەوەى مرۆڤ زياتر تێبگات ئەزمون و، بيرەوەرى كەسە سەربازييەكان بە درێژايى تەمەنيان سەرچاوەيەكى گەورەيە بۆ زانست و، زانين. بە پێى خوێندنەوەى ئەوئەزمونانە بە جوانى و، بەوردى لە سەرجەم تيۆرياكان تێدەگات و، هەنگاوى دروست دەنێت. بۆيە تێگەشتن لە تيۆرياى فەرماندەى سەربازى پێويستە لە ژێر بنەماكانى ئەخلاقى و، فەلەسەفى زانستى بەدەست بهێنرێت.

## ڕێگەكانى گەيشتن بە فەرماندەيى:

چەند ڕێگەيەك هەيە كە مرۆڤ بە ئاسانى ئەتوانێت بگاتە پێگەيەكى باشى فەرماندەيى:

١- بونى هەندێك پەسنى كەسێتى لاى تاكەكان وەك: زيرەكى و، بليمەتى و، توانا و، كاريگەرى و، كەسپى بەرامبەر و، ئارەزو و، سەركێشى و، سەرنج ڕاكێشان و، هەڵسەنگاندنى خود و، دەرو پشت، ئەمانە ئاسانكارێكى زۆر باشن بۆ ئەوەى تاكەكان بتوانن ببنە فەرماندە و، سەركردە، بۆيە فەرماندەى گشتى هێزە چەكدارەكان دەبێت ئەم تايبەت مەنديانەى هەبێت.

٢- ڕێگەی دانانی، دەبێت دەسەڵاتی باڵا ئەم تاکانە هەڵبژێرێت کە ئەو پەسن و، شایستەییانەیان تیایە، بۆ ئەوەی کەسێکی شیاو بخەنە ئەو جێگە باڵایە و، توانای ئەوەی هەبێت لەسەر بنەمایەکی بەهێز پەیوەندییەکانی لەگەڵ بەردەست و، شوێن کەوتوانی دروست بکات، ئەوکات ئەو کەسە فەرماندەییەکی ڕێکخراو و، فەرمی پیادە دەکات.

٣- لەڕێگەی هەڵبژاردنەوە، کەسەکە بە پێی لێوەشاوەیی و، توانایەوە بگاتە بارەگای فەرماندەیی، کە بەهۆی دەست نیشان کردن و، هەڵبژاردنی کۆمەڵەکەیەوە دیاریکراوە، زۆر جار ئەو کەسانەی کە دەگەنە فەرماندەی گشتی هەموو هێزە چەکدارەکان لە ڕێگەی هەڵبژاردن و، کاندید کردنییەوە ئەنجام دراوە، وەك هەڵبژاردنی سەرۆکی کۆمار، یان سەرۆکی پەرلەمان، یان ئەندامانی ئەنجومەنی حوکم و، ئەنجومەنی نوێنەران.

٤- یان لەڕێگەی کودەتا و، سەپاندنی هێزی خێڵ و، عەشیرەت و، پێگەی جەماوەری و، دارایی بەهێز، یان بەهۆی ڕێگەکانی دیکەی وەك بەریتیل و، هەرشەشە و، گوڕەشە گەیشتوەتە دەسەڵات، ئمەش لە هەندێك وڵاتی دیکتاتۆری دەبینرێت.

## تاقیکردنەوەی فەرماندە و، گەشە پێدانی:

دەست نیشان کردنی فرماندەی شیاو و، بەتوانا لەڕێگەی فەرماندەیی کردنی بەردەستەکانی و، هەڵبژاردنی و، گەشە پێدانی فەرماندەیی دەست نیشان دەکرێت. زۆربەی جار بەم ڕێگە دەبێت: کامیان باشترین ئەنجامی هەیە بۆ فەرماندەی چالاك: پڕۆسەی هەڵبژاردن و، تاقیکردنەوە یان پڕۆسەی گەسە پێدان. هەردووکیان زۆر گرنگن بۆ دەست کەوتنی فەرماندەییەکی چالاك. بەڵام تاقیکردنە و، هەڵسەنگاندن باشترە بۆئەوانەی کە پێوانە و، هەڵسەنگاندن نازانن. گەشە پێدانی فەرماندەیی لە ڕێگەی تاقی کردنەوە باشترین چارەسەر بۆ بەدیهێنانی مەبەست.

## هەڵبژاردنی فەرماندە:

یەکێك لە ئەرکە گرنگەکانی فەرماندەی سەربازی: ئاڵنگاری و، کێبەرکێیە، ئەویش دەست نیشان کردنی فەرماندەکانە لە بەردەستەکانیانە لە ئاراستەکردن و، گەشە پێدانیان. لە جێ باسی پێشوودا باسی ئەو جوگمە بنەڕەتیانەمان کرد کە ڕووبەڕوی فەرماندەی سەربازی دەبێتەوە.

**بۆ پیادەکردنی باشترین بژاردە، پێویستە فەرماندە باشترین ڕێو شوێنی جوگرافیای دەورو پشتی بزانێت. واتە: پێویستی بەوەی کە شیکاری تەواو و، گونجاو بکات بۆ هەموو تاکێك کە گونجاوە بۆ دیاری کردنی یان نا. زۆربەی ئەو گۆڕانکارییانەی فەرماندەی چالاکی پێ جیا دەکرێتەوە تا ڕادەیەك بەردەوام بونیان. وەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا شێوازی چارەسەرکردنی هاوسەنگییەکان هۆکارێکە بۆ ناسینی فەرماندەکان.**

**تەنانەت دیمەنی دەرەکی فەرماندە سودی بۆ پلەو پایەکەی نییە. بەڵکو ئەو تایبەت مەندیانە گرنگە لە دیمەنی فەرماندەدا هەبێت پێویستییەکانی کەسی فەرماندەیە، ئەو ڕاستییە هاوسەنگانە پێویستە ئاراستەی فەرماندە دەکرێن، کە فەرماندە ڕاستییەکان لە ناخیاندا هەڵیانگرتووە. چەندین گۆڕانکاری هەیە کە ئەو جیاکاریانە بەدی دەهێنن کە دەبێتە هۆی دروست بونی فەرماندەیەکی بەهێز. ئەم جیاکاریانە دەرفەتێکی باش بەهەندێك فەرماندە دەدات بە بەردەوامی ڕۆڵی فەرماندەی خۆیان بگێڕین.**

## گۆڕانکاریەکانی فەرماندەیی:

**(ڕالف م. ستوغدل) لە ناو کتێبەکەی لە پوختەی گشتی کتێبەکەی باسی دەکات، ئاماژە بە شەش خاڵ دەکات پەیوندییان بە فەرماندەییەوە هەیە (ستوغدل، ساڵی ١٩٤٨)**

ئەوانيش: بەتوانايى، دەستكەوت، بەرپرسياريتى، بەشدارى كردن، پلە و، هەلوەستە. ئەمانە هۆكارى سەرەكين بۆ دەست نيشان كردنى تواناكانى فەرماندەيى، ئەتوانى ئەم خالانە بەبەر هەر فەرماندەيەكدا ببريت كە شياوى فەرماندەييە.

هەميشە دەستكەوت يەكيكە لەو گۆرانكاريانەى بە ئاسانى ئەتوانى ستايشى بكەيت، چونكە دەستكەتى تاكەكە لە رابردوودا، زۆربەى جار شتانى تۆماركراون. ئەتوانيت ئەو دەرفەتەى پى بدەيت بۆ ئەوەى دەستكەوتى زياتر بە دەست بهينيت.

يەكيك ديكە كە (ستوغدل) باسى كاريگەريەكانى فەرماندە دەكات، ئەو جياوازيانەيە لە كۆمەلەكانى ديكەى جيا دەكاتەوە، بەوەى بەشيكە لە هەلوەستەكان. ئەويش بە لەبەرچاو گرتنى ئاستى شوينكەوتنى عەقلى لە پلە بەندى و، تواناو، بەرهەمەندى و، پيويستى و، بەرژەوەندييەكانيان. هەروەها دەستگرتن بەو ئامانجانەى كە پيويستە بەدى بهينرين و، پيادە بكرين. گرنگى ئەم كارە لەوەدايە كە پيويستە هەموو فەرماندەيەك ستايش و، هانى بەردەستەكانى بدات.

## پرۆسەى دەست نيشان كردن و، هەلبژاردن:

ئەمە زۆر دەگمەنە، لە كاتێكدا كەسێك زۆر گونجاوە و، هەموو مەرجەكانى تيايە و، دەرفەتى ئەوەى هەيە ببێت بە فەرماندە، دواتر بە شێوەيەكى گونجاو هەڵدەبژێرێت و، دەكرێت بە فەرماندە. بە هەست كردن بەم ديارى كردنە، گرنگى بە باشترين دەر ئەنجام دەدرێت ئەويش پڕۆسەى هەڵبژاردنى فەرماندەكەيە. دواى ئەوەى پێوەرەكانيان دياريكرد، كار لەسەر دياريكردنى گرنگى ئەو ڕێژە گۆڕانكاريە دەدرێت كە تيايدا هەيە. ئەبێت فەرماندە ئەو شەش مەرجەى كە پێشتر باسمانكرد تيايدا هەبێت. ئەگەر ئەم شەش مەرجەى تيا بوو ئەوكات لەسەر پلەكانيان دەوەستێت، پێويستە پاڵێوراوان لەگەڵ ئەو مەرجانەدا، شياوێتى ئەو پۆستەشى تيابێت. هەنگاوى كۆتايى ئەوەى كاتێك زانيت ئەو فەرماندەيە ئەو مەرجانەى تيانييە كە پێشبينيت دەكرد، لەوكاتەدا پێويستە دووبارە چاو بخشێنيتەوە بەو ڕيزبەنديەى لەكاتى هەڵبژاردندا دەستت كەوتووە، واتە كەسى دووەم بخەيتە شوێنەكەى، ئەم هەڵسەنگاندنە بۆ پڕۆسەى دانانى فەرماندە پڕۆسەيەكى بەردەوامە.

## گەشە پێدانى فەرماندە:

دواى ئەوەى كەسێك كرا بە فەرماندەى كۆمەڵێك، بەرپرسيارێتييەكى ديكەى دێتە بەردەم ئەويش بەرپرسيارێتى

تەواو کردنی کارەکەیەتی بە باشترین شێوە. دوبارە پێویستە بەردەستەکانی ڕێکبخاتەوە. کاری فەرماندە بۆ ڕێکخستنەوەی سەربازەکان زۆر قورسە. گواستنەوە و، گۆڕینەوە و، سپاردنی ئەرکە تایبەتەکان و، بەردەوام بەرپرسیەکان کێشە و، ئاریشەکانیان دێتە بەردەم. لەبەر ئەمانەیە گەشە پێدان بە پۆستی فەرماندەیی لە ناو هێزە چەکدارەکاندا زۆر گرنگە. بۆیە هەمیشە پێویستە سوپا لە کاتی ئاشتیدا لە خۆ سازدان و، خۆ ڕێکخستنەوەدابن. هەمیشە چاو لەسەر ئەوە بێت ڕەنگە کەسانی دیکە شیاوی فەرماندەیی بن و، جارێك ئەو دەرفەتە نەخرابێتە بەردەمیان.

## ئامانجەکانی گەشە پێدانی فەرماندەیی:

سەرکەوتنی فەرماندە تا ڕادەیەکی باش پابەندە بە توانا و، لێوەشاوەیی خۆی. هەروەها لەسەر بەدەمەوە چونی داواکاریەکانی بەردەستەکانی وەستاوە، بەدەست هێنانی ئامانجەکەی لە هەر بارودۆخێکدابێت. ئەمەش سودە تایبەتەکانی جیاکردنەوەی کەسەکانە. دەبێت هەموو ئەو بەربەستانە لابەرێت کە لە بەردەم توانا و، چالاکییەکاندا دەوەستێت، لە ئایندەشدا بتوانێت چارەسەری سەرجەم کێشەی کۆمەڵەکەی بکات و، هەڵوەستەی بەرامبەر ڕوداوەکان هەبێت.

دەبێت فەرماندی ببێتە خاڵی بەهێزکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیی و، مرۆییەکان کە تایبەتە بە چالاکی کۆمەڵاتییەکان لەناو کۆمەڵەکەی. دیاری کردنی ئەرکی هەر یەکێك لە تاکەکانی کۆمەڵەکەی ئەرکی سەرەکی فەرماندەیە، ئەمەش لە پێناو دەستەبەر کردنی پێویستی تاکەکانی ئەو کۆمەڵگەیە. بە مامەڵە کردنی مرۆیی لەگەڵ ئەندامەکانیدا توانای ئەوەی هەیە کە زۆر کێشە چارەسەر بکات ئەمەش یەکێکە لە هونەرە سەرکەوتوەکانی فەرماندەیی. ئەم جۆرەیان زۆر قورستر و، کێشەدارترە لەوەی بە شێوەیەکی میکانیکی گەشەیان پێ بدەیت. چونکە ئەم جۆرەیان توشی گلەیی وگازندە و، ڕوگیری دەبیتەوە لەلای ئەندامانی کۆمەڵەکەت.

## بەرپرسیارێتی گەشە پێدانی فەرماندە:

فەرماندە و، بەردەستەکانی بەرپرسن لەسەر گەشە پێدانی فەرماندەیی کۆمەڵەیەك. پێویستە فەرماندە بەردەوام گرنگی بە ڕاهێنان بدات لە بواری فەرماندەی فەرمی و، نا فەرمی و، هەڵسەنگاندن، پێشنیارکردن و، چالاکی جۆراو جۆر لە بوارەکەی خۆیدا. ئەم بوارانە پەیوەستە بە گۆڕینەوەی پەیوەندیی نێوان دوان.

## لیوای یەکی پاراستنی سلێمانی

لە گەشە پێدانی خودی فەرماندەدا، پێویستە لەسەر فەرماندە بەردەوام لە گۆڕانکاریدا بێت، بەتایبەت گۆڕانە گرنگ و، پێویستەکان بۆ گۆڕان و، تاقیکردنەوەی ئەزمونی نویٚ. ڕەنگە ئەمەش لە میانەی خوێندنەوە و، بەدواداچون بۆ دانانی بەردەستەکانی، یان بەشداری کردنی لە کەسە دەست نیشان کراوەکان بەدی بێت، یان زۆر جار بەهۆی لێپرسینەوە لە خۆی و، خۆ بەراوردکردنی بەوانی دیکە بتوانێت ئەم کارەبکات. مەبەست لە شوێن کەوتن و، چاو لێکەری نییە، بەڵکومەبەست لە چاککردنی و، هاتنی بیری نویٚ و، ناوازەیە بۆ بەڕێوەبردن.

دەروونناسی وەها سەیری فەرماندەیی دەکات کە وەك پەسن و، سیفەتێك وایە لە هەندێکدا هەیە و، لە هەندێکی دیکەدا نییە، بەڵام لەکۆتاییدا دەگەنە ئەو بڕوایەیە کە فەرماندەیی تەنها یەك تایبەت مەندیی نییە، بەڵکو بریتییە لە کۆمەڵێك تایبەت مەندی.

ئەم تایبەت مەندیانەش بەهۆی ئەزمون و، هەڵوەستەکانەوە بەدەست دێت، هیچ پەسن و، تایبەت مەندیی نییە بگونجێت بۆ هەموو شوێن و، کاتێك، هەموو کۆمەڵەیەك ئامانج و، بارودۆخی تایبەت بەخۆی هەیە و، هەر جۆرە فەرماندەییەکیش بۆ باوردۆخێك گونجاو و، ڕێگە پێدراوە و، کە کاتی دیکە ناگونجێت.

# تیۆریاکانی فەرماندەیی

## تیۆریای پیاوی مەزن:

فرنسین جالتون یەکێکە لەو کەسانەی زۆرترین باسی ئەم تیۆریایەی کردووە، دەڵێت: ئەو گۆڕانکاریانەی لە کۆمەڵگە ڕودەدەن بەهۆی ئەو کەسانەوەیە کە خاوەنی بەرهەرە و، توانایەکی بەرزن، بەڵام فەرماندە بەتەنها توانای ئەو گۆڕانکاریانەی نییە ئەگەر هاتوو بەردەستەکانی وەڵامیان بۆ پیادەکردنی گۆڕانکاریەکان نەبێت، بۆیە پێویستە تاکەکانی کۆمەڵەکە بەدەم گۆڕانکاریەکانەوە بچن.

## تیۆریای سەرناسی:

توێژینەوە دەروونییەکان ئاماژە بەوەدەدەن منداڵان توانای جەستەیی و، عەقڵی و، کۆمەڵایەتی و، دەروونیان جیاوازترە لە کەسانی دیکە، لە ناو منداڵاندا ئەوانەی کە لە هەمویان بەرزترن و، قەبارەیان گەورەتر و، جوانترن ئەوانە ئەو جۆرە کەسانەن کە زۆر متمانەیان بەخۆیان هەیە و، توانای چالاکی و، گۆڕانکاری کۆمەڵایتیان بەرزترە لە کەسانی دیکە، توانای کۆڵنەدان و،

**کۆششکردو تەمایان زیاتر و، بەرز خوازیان زۆرترە و، گونجاوترن بۆ ئەوەی ببن بە فەرمانده لە کەسانی دیکە.**

**تیۆریای سەرناسی هەندێك تایبەت مەندی کەسی فەرماندەی دیاری کردووە، لەوانە: ژیری و، توای دەست پێشخەری و، کۆڵنەدان و، پێداگری و، بەرز خوازی و، دروستی عەقڵی و، پەیوەندی کۆمەڵایەتی، ئەمانە وەك: تایبتەت مەندییەکانی فەرماندە دیاری کردووە. بەهەموو ئەم خاڵانە ئەتوانین فەرماندەی سەرکەوتو دیاری بکەین، هەرچەند ڕەنگە فەرماندە دەر بچێت جیاواز لەم تایبەت مەندیانیە، بەڵام ئەوانە پێیان ناوترێت فەرماندە و، بەهۆی بارودۆخ و، هۆکارێکی تایبەت بونەتە فەرماندە.**

## تیۆریای هەڵوەستەکردن:

**بۆمان دەرکەوتن کە کەسێتی فەرماند کۆمەڵە تیۆر یایەك و، باردۆخی کۆمەڵایەتی دیاری دەکات. لە پێشیاندا زۆر کەس لەو جۆرە کەسانە دەرکەوت و، هەڵکەوتون، بەڵام لەگەڵ مردنیشیاندا بیرو بۆچون و، ئامانجەکانیشان مردووە، نەگەیشتون بەە فەرماندەیی، چونکە بارودۆخۆی کۆمەڵایەتی نەگونجاوە بۆ ئەوە ببن بە فەرماندە و، شوێنی بیرو بۆچونەکانی ئەوانی تیا نەبوەتەوە. بۆ نمونە ئەگەر لە بواری زانستی بڕوانین زۆر کەس لە**

زانایان ویستویانە بفڕن یان بڕۆنە بۆشایی ئاسمان، بەڵام ئەم نەگەشتون بەم ئامانجەیان، چونکە تەکنەلۆژیا هێندە پێشکەوتو نەبوو.

هەندێك تایبەت مەندی ڕەنگە بونی هەبێت بەڵام کات لەبار نییە بۆ ئەوەی ببێت بە فەرماندە و، ئامانجی خۆی بپێکێت.

## تیۆرای پیشەیی:

فەرماندەی لە ژێر سایەی ئەم تیۆریایەدا هەڵدەستێت بە پیادەکردن و، بەدی هێنانی هەندێك ئامانج و، چاککردنی پەیوەندی نێوان ئەندامەکانی و، دەستگرتن بە کۆمەڵەوە. بۆ ئەوەی نەك تەنها یەك فەرماند بەدی بهێنیت، بەڵکو بۆ ئەوەیە کە چەند کەس پێ بگەیەنیت.

## ئەو مەرجانەی کە پێویستە لە فەرماندە شیاودا هەبێت:

لێرەدا مەبەستمان ئەوە نییە بە گشتی ئاماژە بە فەرماندەکان بدەین، بەڵام دەمانەوێت ئاماژە بە فەرماندەیەکی دیموکراسی دور لە خۆ سەپێنی پڕ لە کێشەی بکەین، خاڵێکی سەرەکی هەیە بۆ ئەوەی هەموو فەرماندەکان ئاگایان لەوەبێت کە خۆ سەپاندن بە چاو سورکردنەو و، توڕەبون و، ئەژمار نەکردنی

بەردەستەکانی بەدی نایەت، پێویستە فەرماندە شیاوی بێت بۆ سەرجەم بوارە کۆمەڵایەتی و، پیشەیی و، سیاسییەکان، مرۆڤ بە فەرماندەی ی لە دایك نابێت، بەڵکو بەهۆی تێکەڵبونی بە کۆمەڵگە توانای ئەوەی هەیە بەهرەمەندییەکانی فەرماندەیی لەخۆیدا بەدی بهێنێت. ئەتوانین بەکورتی ئەو مەرجانە دیاری بکەین کە لە فەرماندەی سەرکەوتودا هەیە، بریتییە لە:

١- توانای ڕێکخستنی گفتوگۆ و، بەڕێوەبردنی کۆبونەوەی هەبێت، بە بەشداری بەردەستەکانی و، گوێگرتن لە بۆچونەکانیان و، وەرگرتنی بۆچونی دروست.

٢- توانای پاراستنی کەمینەکان و، بڕواهێنان بە تونرەوەکانی ناو کۆمەڵگەکەی هەبێت و، دور بکەوێتەوە لە دوژمنایەتی و، دژایەتی و، شارچێتی.

٣- توانای بڕیاردان و، دەرکردنی فەرمانی هەبێت، بەڵام خۆی بەدوور بگرێت لە بڕیاری بەپەلە و، خێراو، خۆی بپارێزێت لە زیادە فەرمانی.

٤- مامەڵەی دروست و، شیاوبێت و، هاوسەنگی لە مامەڵە کۆمەڵایەتی و، پابەندبونی دەروونی و، بەشداری ویژدانی و، توانای هاوکاری و، ڕێزگرتنی هەستی بەرامبەر، لێبوردن هەبێت.

٥- تواناى پێشبنى دروست بۆ ڕوداو و، پێشهاتەكان و، كاركردن لەسەر خۆ گونجاندن لەگەڵیانى هەبێت.

٦- ئامادەى وەرگرتنى تەواوى دەر ئەنجامەكانى هەبێت.

٧- پەیوەندى لەگەڵ تاكەكاندا پەیوەندییەكى خۆشەویستى و، دڵسۆزى بێت، زۆر بارگرانیان بۆ دروست نەكات.

٨- تواناى بەستنى پەیوەندى كۆمەڵایەتى دروست و، سەركەوت.

٩- تواناى ڕێكخستنى كۆمەڵایەتى.

١٠- لێكچون و، هاوشێوەیى لە نێوان خۆت و، بەردەستەكانتدا، چونكە فەرمدە نابێت جیاوازبێت لە بەردەستەكانى لە خۆزگە و، پێداویستییەكانیان.

هەرچەند بونى خەسڵەتى تایبەت نییە كە بۆ هەموو شوێن و، جێگە و، پێگە و، كاتێك بگونجێت، چونكە ئامانجى كۆمەڵەیەك جیاوازە لە كۆمەڵەیەكى دیكە.

بەڵام پێویستە فەرماندە كۆمەڵێك پاڵنەرى هەبێت بتوانێت چالاكییە فەرماندەییەكانى خۆى بجوڵێنێت، وەك سەلماندنى

خود و، بەدی هێنانی ویست و، ئامانجی کۆمەڵەکەی و، سەرکەوتنی هاوڕێکانی.

یەکێك لە تایبەت مەندییەکانی فەرماندەی لێوەشاوە هاوسەنگییە لە دەربڕین و، کارەکانی و، خۆگرتنەوە و، خۆ گونجاندنە، چونکە هەرکەس توانای خۆگرتنەوەی هەبێت، باشتر دەبێتە پاڵنەری بۆ بەدی هێنانی ئامانجەکەی.

فەرماندە دەبێت کۆمەڵێك مەرجی تایبەتی تیا بێت، وەك زانینی هەندێك کاری هونەری و، دەست ڕەنگی پیشەی و، ئەزمونی کۆمەلأیەتی. هەرچەند ئەمە بە پەسنی پێگەیشتویی ئەفسەر دادەنرێت.

ئەم تایبەت مەندیانیە پێویستییەکانی فەرماندەی سەرکەوتون، چونکە بەهۆی ئەم تایبەت مەندیانەوە ئەتوانن ئەرکە گرنگەکانی کۆمەڵەکە بە دروست بە ئامانج بگەیەنن، لە ناویاندا گیانی مەعنەوی، گیانی برایەتی کۆمەڵەکە و، دروستکردنی کەشی دروست و، بەدی هێنانی ئامانجی کۆمەڵەکە و، باشکردن و، چالاککردنەوەی بیرکردنەوی کۆمەڵەکە. گیانی مەعنەوی فەرماندە لەسەر ئەو پیشانە وەستاوە کە فەرماندە پێی هەڵدەستێت، تا فەرماندە باشتر کاربکات و،

بژاردەی باشتر پیادە بکات ئەوە گیانی مەعنەوی بەردەستەکانی بەرزتر دەبێتەوە.

## شیکاری بۆ ڕوکەشی فەرماندە:

تیۆریای پیاوی مەزن، یەکێك لە دامەزرێنەرانی ئەم تیۆریایە (فرانسیس جالتون)ە، باسی ئەوە دەکات کەگۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان لە ژیانی خەڵکدا لەناو ئەو کەسانە ڕودەدات کە خاوەنی توانا و، بەرهەمەندییەکی ناوازەو باڵادەستن. چونکە فەرماندە تایبەتمەندی هەندێك مرۆڤە و، لە کەسانی دیکەدا نییە. مرۆڤی سەرکەوتو پشت بە کۆمەڵێك تایبەتمەندی دەبەستێت کە لەکەسێکدا بونی هەبێت، هیچ تایبەت مەندییەك نییە بۆ هەموون کات و، شوێنێت بەڕەهایی بگونجێت.

فەرماندە هەرچەند ئەو تایبەت مەندیانیە تیا بێت ئەوە بە فەرماندەیەکی سەرکەوتو دانانرێت، ئەگەر لای بەردەستەکانی بە ئەرێنیانیە بیری لێنەکەنەوە، فەرماندە ناتوانێت هیچ گۆڕانکارییەك بکات لە ژیانی خەڵکدا ئەگەر عەقڵیان ئامادەی گۆڕانکاری نەکات و، بەگوڕ و، تین نەیەن بە دەم داواکاریەکانەوە.

توێژینەوە هاوچەرخەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە گرنگی نەدانی فەرماندە بە بەردەستەکانی لە کەسێتی و، توانای

سەركەوتنى فەرماندەيى كەم دەكاتەوە، هەرچەند زۆر جار فەرماندە بەهۆى بارودۆخى كۆمەڵايەتى لە دايك دەبێت، مەرج نييە فەرماندە لەهەڵوەستەيەكدا سەركەوتو بێت ئيدى چاوپۆشى لە تايبەت مەندييەكانى ديكە بكەيت.

تيۆرياىەكى ديكە هەيە، بە تيۆرياى هەڵوەستە ناو دەبرێت، باسى ئەو دەكات كە فەرماندە پێويستە بۆ بەدى هێنانى ئامانجەكانى كۆمەڵێك بەهرەمەندى و، توانا و، ژيرى و، دانايى تيا بێت.

لەڕوى پەروەردەييەوە پێويستە هەميشە تاك ڕاهێنان لەسەر فەرماندەيى بكات، بۆيە لێرەوە دەتوانێت سەرجەم پێويستييەكانى فەرماندەيى لە بوارە جۆراو جۆرەكانى سياسەت و، كۆمەڵايەتى و، ئابورى و، پيشە سازيس و، پيشەيى بەدى بهێنێت، چونكە فەرماندە بە فەرماندەيى لە دايك نابێت، بەڵام بەهۆى خۆ ئامادەكردن و، خۆسازدان ئەو چالاكيانە لە خۆيدا فەرماندەيى لە دايك دەبێت.

## شێوازەكانى بەڕێوەبردن و، فەرماندەيى:

چەند جۆر و، شێوەيەكى فەرماندەيى هەيە، ديارترينيان:

١- فەرماندەيى ديكتاتۆرى و، خۆ سەپێنى و، تاكڕەوى.

٢- فەرماندەيى ديموكراتى.

٣- فەرماندەيى ئازادى ڕەهايى.

١- جۆرى يەكەم ئەو جۆرەيە كە تەواوى دەسەڵاتەكان لاى خۆى كۆ كردوەتوەت و، بە داپڵۆساندن و، سەركوت كردن پيادەى بكات، سياسەتى كۆمەڵەكەى بەو شێوەيە دادەڕێژێت كە خۆى دەيەوێت، خۆى سەرچاوەكانى پاداشت و، سزا ديارى دەكات، تەنها پشتى بەخۆى بەستووە.

لە ژێر سايەى ئەم جۆرە فەرماندەييەدا كار و، پيشە و، ئەركى تاكەكان ديارى كراو نييە و، ناڕونە، زۆرجار يەكگرتوى و، پەيوسەتبون و، وابەستە بوون لە ناو ئەندامەكانياندا بونى نييە. ئەوكاتەى كە لەبەرچاو ئەندامەكانى ون دەبێت، سەرجەم فەرمان و، ڕاسپاردەكانيشى ون دەبێت.

٢- بەڵام فەرماندەى ديموكراسى ئەو فەرماندەيە كە بەشدارى بە تەواوى ئەندامى تاقمەكەى دەكات، لە چالاكى و، دياريكردنى ئامانج و، پلاندانانندا.

ئارەزوى ئەوە ناكات كە جەخت بكاتەوە سەر ئەوەى دەسەڵاتەكان بەدەستى خۆيەوە بێت، بەڵام ئارەزوى دابەشكردنى بەرپرسيارێت دەكات بەسەر ئەندامەكانيدا، هەروەها پەيوەندى

خۆشەويستى و، دڵسۆزى و، هاوڕێيەتى لەگەڵ ئەندامەكانى دەبەستێت بۆ گەيشتن بەئامانجى كۆمەڵەكەى، سەرجەم ئەندامانى تاقمەكەى وەك يەك جەستە كار بۆ بەدى هێنانى ئامانجەكانيان دەكەن. فەرماندەى ديموكراتى چێژ لە كارى بەكۆمەڵ دەبينێت، هەميشە دەبينى تاقمەكەى كەمترين دژايەتى يەكتر و، ناكۆكى و، يەكتر نەخوێندنەوە بەرامبەر بە يەكدى دەكەن، هەمو كارەكانيان بۆ بەدى هێنانى ئامانجى تاقمەكەيانە.

٣- فەرماندەيى ئاڵۆز و، سەر بەكێشە: ئەو تاقمانەن هەميشە فەرماندەكانيان بە سەربەخۆيانە و، بىێ گوێدانە سەروى خۆى بڕيار دەدەكات و، بەردەوام لە كێشەدايە، ڕێگەش نادات گفتوگۆ و، مشتومڕ لەگەڵ خواروى خۆيدا بكات.

ئەندامى ئەم تاقمە فەرماندەكانيان خۆش ناوێت، چونكە هەميشە بەردەستەكانى دەچەوسێنێتەوە، بەردەوام بە سەربەخۆى و، خۆ ويستانە بڕيار دەدات ئەگەر ڕوكەش فەرمانەكانى پيادە بكەن ئەوە بەتەواوى ئەنجامى نادەن و، بەردەستەكانيش بەدواى كێشەوەن بۆى.

## بڕیاری هاوجەنگی بەکۆمەڵ:

تویێژینەوەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە ئەو بڕیارانەی بەکۆمەڵ دەردەکرێت تەواوی ئەندامانی کۆمەڵەکە ئارەزوی پیادەکردنی دەکەن، لە کۆتایشدا ئەنجامی زۆر باش و، بەرچاوی لێ بەرهەم دێت، چونکە تەواوی ئەندامانی تاقمەکە کار لەسەر ئەوە دەکەن، بۆیە ژیانی سەربازی پڕیەتی لە دانوستان و، کارکردن بۆ گرتنە بەری بڕیاری بەکۆمەڵ و، هاوجەنگی لەسەر یەك بڕیاری ڕاوێژ لەسەرکراو.

## شوێنەواری کاریگەری شێوەی بەڕێوەبردن لەسەر ڕەوشی کۆمەڵ و، ئاڕاستەکردنەکانی:

تویێژینەوەکان ئاماژە بەوەدەدەن کە کاریگەری فەرماندەی دیموکراسی زۆرترە لە کاریگەری فەرماندەی دیکتاتۆری یان تاکڕەوی، بەتایبەت کاریگەری کۆمەلایەتی بوون لەسەر دەر ئەنجام و، بەرهەمی تاکی ئەو کۆمەڵەیە.

(کیرت لیفین) ئەم تاقیکردنەوەیەی لەسەر مندالان ئەنجان داوە: کۆمەڵێك مندالی هێناوە کارێکی پێ سپاردوون، کردونی بە چەند گروپێکەوە، هەر گروپە و، لەژێر فەرماندەیی کەسێك، ئەو تاقیکردنەوەیە بۆ ماوەی چەند حەفتەیەك بەردەوامبووە،

بۆی دەرکەوتووە ئەو گروپەی کە فەرماندەیەکەی تاکڕەوانە و، دیکتاتۆریانە بڕیاری بەسەر بەردەستەکانیدا داوە کارەکەیان وەك ئەوانە تەواو کردووە کە لە ژێر فەرماندەیی کەسێك ئەنجام داوە بە دیموکراتی لەگەڵیان جوڵاوەتەوە، بەڵام ئەوەی دووەمیان کوالێتی و، باشی کارەکەیان لە پێشتربووە لەوەی یەکەمیان، هەرچەند وەك یەك کاریشیان کردووە، بگرە هەمیشە ناکۆکی لەناو دەستەی یەکەمدا دروست بووە و، بەردەوام لەکێشەدابوون، بەردەوام بۆ ئەنجام گەیاندنی فەرمانی فەرماندەکەیان ئامادەی شکاندنی هاوڕێکانیان بوون، لەکۆتایشدا تامەزرۆی شکاندنی فەرماندەکەیان بووە، جیاواز لەو مامەڵەی گروپی کەسە دیموکراتەکە ئەنجامی داوە.

پەیوەندی نێوان ئەندامانی گروپی کەسە دیکتاتۆریەکە پەیوەندییەکی دوژمنکارانە و، ناکۆکی بووە، هەمیشە لە ململانێی سەرکەوتندابوون بەسەر هاوڕێکەیاندا، واتە: مامەڵەی دیکتاتۆری هەستی دیکتاتۆری و، دوژمنایەتی لادروستکردوون و، مامەڵەی دیموکراسی هەستی دیموکراسی و، خۆشەویستی لادروستکردوون، هەمیشە ئەوانەی لە ژێر چەتری دیکتاتۆریدا کۆبونەتەوە زوتر لەبەریەك هەڵدەوەشێنەوە.

کاتێك تاقمێك توشی ڕەشبینی بوون بەردەوام لە شکست و، نزمبونەوەدا و، هەمیشە بەرەو لەیەکترازان هەنگاو دەنێن و، پەنجەی تۆمەت بۆ یەکتری هەڵدەکێشن.

## سایکۆلۆژیای سەرپەرشتی و، بەڕێوەبردن:

کەشی دەروونی کۆمەڵ هەمیشە بۆ شێوەیەك لە سەرپەرشتی و، بەڕێوەبردن هەنگاو دەنێت. هەمیشە ئارەزوی ئەوەدەکەن سەرپەرشتی سەربازەکانی دیکە بکەن، وەك سەرپەرشتیاری خێزان، چۆن باوك هەمیشە دەیەوێت ئەو ڕۆڵ ببینێت.

کۆمەڵێك دەروونناس لە یەکێك لە کارگەکانی ئەمەریکا توێژینەوەیەکیان ئەنجامدا، تاقیکردنەوەکە لەسەر ئەوەبوو بزانن گیانی هاوکاری و، لەناو کرێکارەکاندا لە چی ئاستێکدایە، کرێکارەکانیان بەسەر دوو تاقمدا دابەشکرد، بینیان ئەو گروپەی کە لەسەر بنەمای برایەتی و، خۆشەویستی کارەکەیان پێ سپێراوە بە ڕێژەی (١٠٪) بەرهەمەکەیان بەرزبوەتەوە، بەڵام ئەوەی کە بە توندوتیژی و، تاکڕەوی و، ڕق و، کینە بونیات نراوە کارەکەیان لە (٤٠٪) کەم بوەتەوە.

بەشى پەيوەندييە پيشەييەكانى پەيمانگاى تەكنەلۆجياى كاليفۆڕنيا (٢٥) توێژينەوەيان ئەنجام داوە، بەسەر (١٨) كارخانە دابەشيان كردووە، تەواوى بەشداربوان (٥٠) هەزار كرێكاربوون، بۆيان دەركەتووە كە گيانى مەعنەوى و، ورەبەرزى كرێكارەكان پەيوەندى بە سەرپەرشتى كارەكەيانەوە هەيە.

هەروەها بەشى توێژينەوەيەى كۆمەڵايەتى زانكۆى (ميتشجان) هەستاوە بە ئەنجامدانى توێژينەوەيەكى بەڕێوەبردن، لەسەر تايبەت مەندى و، كاريگەرى شياوێتى بۆ دەر ئەنجامى گيانى مەعنەوى و، فەرماندەيى و، خۆشنودى بەردەستەكانيان لەكاركردندا.

ئەم توێژينەوەيە لەسەر دوو تەوەرى زۆر گرنگ وەستاوەتەوە، بۆ ديارى كردنى شياوێتى بەڕێوەبەر و، بەرپرس، ئەوانيش:

١- كۆى ئەو دەرئەنجامەى لە ميانەى كارەكەوە دەست دەكەوێت لە يەك كاتژمێردا.

٢- هەستى خۆشنودى بەرامبەر ئەو كارەى ئەنجامى دەدات.

توێژينەوەى ئەم پەيمانگايە ئاماژەى بەوە داوە كە پەيوەندييەكى تەواو ئەرێنى هەيە لە نێوان جۆرى سەرپەرشتى

کردن و، گونجاندنی دەرئەنجام، لەنێوان سەرپەرشتیار و، هەستی کرێکارەکە بە خۆشنودی لەسەر کارەکەی. بۆیان دەرکەوتوە پەیوەندی شایستە و، گونجاوی ڕاستەوخۆ کاریگەری لەسەر شیاوێتی کرێکارەکە هەیە بۆ ئەوەی دەرئەنجامی باش و، گونجاو بەرهەم بهێنێت و، کرێکارەکان بەسەرکەوتو کارەکانیان ئەنجام بدەن و، زیاتر هەست بە سەربەستی و، سەر بەخۆیی بکەن.

## ڕێگەکانی ڕاهێنانی سەپەرشتیاران:

چۆن کەسێتی فەرماندەیەکی دروست بەرهەم دەهێنیت؟ چەند هۆکارێك هەیە بۆ پێگەیاندنی فەرماندە لەوانە:

١- وانە وتنەوە:

شارەزایان و، پسپۆڕان و، مامۆستا و، بەڕێوبەر و، سەرپەرشتیاران هەڵدەستن بە ئەنجامدانی وانەی پێویست و، ڕاسپاردە و، فێرکاری بۆیان.

٢- ڕێگەی کۆنگرە و، کۆڕ:

## لیوای یەکی پاراستنی سلێمانی

کۆمەڵێك توێژەر هەڵدەستن بە خستنە بەرچاوی کێشەکان و، دۆزینەوەی ڕێگەچارە بۆیان و، خستنە ڕویی چەندین دەروازە بۆ چارەسەری سەرجەم ئەو کێشانەی ئەگەری ڕودانیان هەیە. بۆ بەستنی گۆنگرەیەکی سەرکەوتوو پێویستمان بەم خاڵانەیە:

١- بابەتی مشتومڕەکە ئەو بابەتانەبێت کە توێژینەوەکان گرنگی تایبەت بەم بوارە بدەن.

٢- تەواوی ئەندامانی کۆنگرەکە بەڕاشکاوانە باسی بۆچوی خۆیان بکەن و، بەشداری تەواوی چالاکییەکانی کۆنگرەکە بکەن.

٣- سەرپەرشتیاران خۆیان پێشتیار و، ڕاسپاردەکانیان بخەنە بەردەست ئەندامانی کۆنگرە.

٤- گونجاوی ئاستی گفتوگۆکە لەئاستی عەقڵی و، شارەزایی و، زانیاری سەرپەرشتیاراندابێت.

٥- ئامانجی کۆنگرەکە گەشە پێدانی هەستی بەرپرسیارێتی بێت و، دروستکردنی ڕێگەچارەی دەربازبوون بێت.

### ئەزمونی بڕیاری کۆمەڵ:

سەرکەوتوترین کار بۆ زانینی ناوازەترین شێوە بۆ گۆڕینی ئاراستەکانی خەڵك، ئەزمونی (کیرت لیفین)ە، لە ماوەی جەنگی

جيهانى دووەمدا ئەنجاميدا، ئەزمونى خۆى وەك گۆڕانى ئەزمونى ئەو خانمانەيە كە لە ناو ماڵدا ئازوقە و، بابەتە خۆراكييەكان تاقى دەكەنەوە و، هەريەكەيان نهێنى خۆى هەيە بۆ بەكارهێنانيان.

هات ئافرەتەكانى كرد بە دوو بەشەوە، باسى تەواوى مادە خۆراكييەكانى ئەو خواردنەى بۆ كۆمەڵەى يەكەم كرد، باسى تەواوى سود و، زيان و، شێوەى مادە خۆراكييكانى بۆ كردن، ئەم تاقمە بە ڕێژەى (٣٪) تاقيكردنەوەيان لەسەر خۆراكەكان كرد و، بەكاريان هێنا، بەڵام گروپى دووەم لەناو خۆياندا مشتومڕيانكرد و، هيچ بۆ باسنەكردن ئەمان (٣٢٪) مادە خۆراكييەكانيان بەكار دەهێناو ئەزمونيان دەكردن، بۆيە پێويست بەوە هەيە هەميشە فەرمانەكان پيادە و، شيكارى بۆ بكرێت، شياوى مشتومڕبێت، لە كۆتايدا سەر ئەنجامى سەرجەم بڕيارەكان بەم شێوەيە دەبێت:

١- بە دانايى مامەڵە لەگەڵ ئەو بەردەستتەت بكە كە ياساى پێشێلكردووە، بۆ ئەوەى خۆشەويستى بۆ دامەزراوەكە بمێنێت.

٢- پێويستە سەپەرشتيار هەميشە بڕواى تەواوى بە بەردەستەكانى هەبێت و، بە دانايى مامەڵە لەگەڵ بەردەستەكانى بكات و، هەميشەبەرەو باشتر بيانبات.

٣- گوێڕایەڵی بەردەستەکان بۆ فەرماندەکەی و، پەروەردەکردنیان نابێت سەرکوتکاری و، پۆلیسی بێت.

٤- دەبێت سەپەرشتیار هەمیشە جیاکاری بکات لە نێوان پابەندبون و، ڕێکخستنی دروست لەگەڵ خۆشەویستی بۆ کارەکە، ئەگەر بەردەست بە هەڵە یان فەرماندە بە ویستی خۆی سزای بەردەستەکەی بدات ئەوە ڕێز لەفەرماندەکەی ناگرێت. بۆیە پێویستە سزادان داد پەروەرانەبێت و، ئامانج لێی پەروەردەکردنی بەردتەسکان بێت نەك بۆ ئەوەی لێی بترسن.

٥- سەرپەرشتیاری ناوازە ئەوەیە کە گەشە بە هەستی متمانە بەخۆبون لەناو ئەندامەکانی دروست دەکات و، ناچاریان ناکات پەنا بۆ درۆکردن و، فێڵ و، دوو ڕویی ببەن. هەمیشە سەرپەرشتیاری باش بەدەوری بەردەستی باشدا دەسوڕێتەوە و، سەپەرشتیاری خراپیش بەدەوری کرێکاری خراپدا دەسوڕێتەوە.

٦- سەرپەرشتیاری باش ئەم دروشمە بەکار ناهێنێت: (لۆمەم مەکەن لەسەر ئەو فێرکاریانی خۆم دام نەڕێژاون) ناڵێت: (من بەندەیەکی فەرمان پێکراوم) ئەم جۆرە سەپەرشتیارایانە دۆست بۆ دامەزراوەکە بەرهەم ناهێنن.

٧- زۆر لەسەر تاوانی کرێکارەکانت مەڕۆ، وەك ئەودایکە مەبە هەمیشە کەم و، کورتی و، هەڵەکانی منداڵەکەی دەدات بەچاویدا و، بەڕوویاندا هاوار دەکات.

٨- سەرپەرشتیاری ناوازە، ئەو سەپەرشتیارەیە کە ڕێز لە کرێکارەکەی و، بۆچونیان دەگرێت.

## ئێستا دەڕۆینە سەر باسکردنی بەشی سێهەم کە مەنهەجی ئازادی و، لێبوردەییە:

٣- مەنهەجی لێبوردەیی:

ئەم مەنهەجە لە ژێر ئاراستەکردنی کارل روجرزی درەونناسی ئەمەریکی دەرهێنراوە، کە کاریگەری زۆر باشی هەیە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییە دەروونییەکان، ئەمە وادەکان هەموو ئەندامانی تاقمەکەی بیر لە چارەسەرکردنی کێشەکان بکەنەوە.

٤- مەنهەجی یاریکردن:

ئەم ڕێگەیە بە پیادەکردن و، ئەنجامدانی شانۆگەری بەکاردێت، ڕۆڵێکی بەرچاو دەبینێت لە چارەسەرکردنی کێشەکاندا، کاردەکات لەسەر ڕاهێنانی تاك بۆ ئەنجام دانی

**هەندێك چالاكی بۆ كاراكردن و، ئازادبون و، كاریگەربونی ئەرێنیانە. سەرپەرشتیاریش ڕۆڵێكی بەرچاو دەگێڕێت لە چالاكییەكەدا.**

**٥- مەنهەنجی گەشە پێدانی هەستەوەرەكان:**

**زانكۆی كالیفۆرنیا ئەم مەنهەجەی دارشتووە ئامانج لێی زانینی ویست و، حەز و، ئارەزووەكانی سەرپەرشتیارانە و، بەوەی چی هەست و، سۆز و، هیوایەتێكیان هەیە.**

## جۆرەكانی فەرماندەی:

**١- فەرماندەی دیكتاتۆری:**

**ئەم فەرماندەییە بەوە جیادەكرێتەوە كە دەسەڵاتێكی ڕەهای هەیە و، تەواوی ئامانج و، نەخشە ڕێگای كۆمەڵەكەی خۆی دەیكێشێت و، بەدەستی خۆیەتی، خۆی جیاكاری زۆر گەورەی لە نێو بەردەستەكانیدا دروستكردووە، خۆی فەرمانڕەوایە و، سەپەرشتیاری پاداشت و، سزاكان دەكات، پشت بەستن و، برایەتی تەواو و، بەهێز لە ناو ئەندامانیدا نییە و، ئەگەر لەبەرچاو ون بێت دۆستانی زوو ون دەبن و، لەبەرچاو ون دەبن.**

**٢- فەرماندەیی دیموکراسی:**

**هەمو ئەندامانی دەستەکەی بەشداری کاریگەریان هەیە لە چالاك و، دیاری کردن و، نەخشە داڕشتن بۆ ئامانجەکانیان، چاو نابڕنە دەستی فەرمادەکەیان بۆ کارکردن لەسەر ئەو ڕسپاردانەی ئەو دەیەوێت یان لەبەرچاو ئەو کار بکەن، بەڵکو هەموان هانی یەکتری دەدەن بۆ ئەوەی ئامانجەکەیان بەدی بهێنن، ئەندامانی ئەم گروپە زۆر تەباتر و، پەیوەست ترن وەك ئەندامی ئەو گروپەی بە دیکتاتۆری فەرماندایان دەکرێت.**

**٣- فەرماندەیی سەربەکێشە:**

**فەرماندە تەواوی ئازادی داوە بە بەردەستەکانی خۆشی بەشداری هیچ کام لە مشتومڕ و، پیادەکردن و، جێبەجێکردنی فەرمانەکانی ناکات، بەردەستەکانی فەرماندەی بێسەرو بەریان خۆشناوێت، بەڵام تاقمەکەیان کەمتر دژایەتی تیایە و، گیانی بەرپرسیارێتییان تیا باڵایە، تەنانەت لەکاتی نەبونی فەرماندەکەیان ئەرکەکانی خۆیان بە باشی ڕادەپەڕێنن. بەڵام وەك کەشی دیکتاتۆری وایە کە فەرماندەکەیان دیار نەبوو ئەمانیش لە کارکردن دەوەستن.**

لەكاتى ديار نەبونى فەرماندەى ديموكراسيدا هيچ كاريگەرى لەسەر ئەنجامەكان نييە، كاتێك تاقمەكەى توشى بێهيوايى و، نائومێدى بوون گروپە ديموكراسيەكە لەبەردەم ئاستەنگەكاندا دەوەستنەوە. بەلاَم ديكتاتۆريەكە زياتر لەبەر يەكتر هەلَدەوەشێنەوە و، سەرزەنشتى يەكترى دەكەن.

هونەرى بەڕێوەبردن:

دوو بنەماى سەرەكى هەيە بۆ لەبەرچاو گرتنى فەرماندية سەركەوتوو: بڕوابونى خودى، پابەندبوو، ئەم دوو خالَە پالَپشتى و، ڕەوشتى فەرماندە ديارى دەكەن، بۆيە پێويستە فەرماندە لەكاتى دەستبەكاربونيدا كەستێتى خۆى ديارى بكات، ئەويش بۆ پيادەكردنى و، دروستكردنى گيانى ئەرێنى بوون لە ناو يەكەكاندا.

## جياوازى سايكۆلۆجى لە نێوان فەرماندەى سەربازى و، بەرێێوەبەرى مەدەنيى:

چەند تايبەت مەندى و، خالَێكى هاوبەش هەيە لە نێوان ئەم دوو بوارەدا، هەروەك خەسلَەتى تايبەت مەندى هەيە لە نێو فەرماندە سەربازييەكاندا، خالَە هاوبەشەكانيان ئەمانەن:

## لیوای یەکی پاراستنی سلێمانی

١- سود وەرگرتنی لە تەواوی زانیارییەکان و، کۆکردنەوەیان لەبواری فەرماندەییدا.

٢- هەبونی بەهرەمەندیی مامەڵەکردن لەگەڵ بارودۆخەکاندا.

٣- فەرماندەیی سەربازی جیاوازە لە فەرماندەیی ئۆرکسترایەکی هونەری.

٤- زیرەکی.

٥- بیرفراوانی.

٦- نەرم و، نیانی.

٧- متمانە بوون.

٨- پێداگری.

٩- توانای بڕیاردانی دروست.

١٠- هاندان و، پاڵپشتی وئاڕاستەکردنی بەردەستەکانی.

١١- توانای.

أ- پلاندانان.

ب- پیادەکردن.

ت- هەستانەوەی هەبێت.

١٢- کارکردن.

١٣- میهرەبانی.

١٤- یەکلایی کەرەوە.

١٥- بابەتیانە بێت و، دور بکەوێتەوە لە خود پەسەندی.

فەرماندە ئەو کەسەیە کە بە ژیری سەیری ئایندەی دەکات، بەهۆی دوربینیەوە ڕوداوەکان لێک دەداتەوە و، شیکاریان بۆ دەکات، ئامانجەکانی بە گونجاوی دادەڕێژێت، لەم پێناسەیەدا بۆمان دەر دەکەوێت کە پێویستە فەرماندە ئەم خاڵانەی تیا بێت، ئەگەر هەموشی تیا نەبێت ئەوە پێویستە ئەوانەی کە تیایدا نییە لەخۆیدا دروستی بکات:

١- فەرماندە کردارە نەک گوفتار.

٢- خۆ پارێزی و، کاری چاک بنەمای فەرماندەییە.

٣- پارێزەری یەکێتی و، یەکبونی سوپاسە.

٤- بونی ئامانج بۆ شوێنکەوتوانی.

٥- پێشکەش کردنی ڕاسپاردەی چاک و، ئاراستە کردنی دروست بۆ تاکەکان.

٦- چاککردنی خود بەر لەوانی دیکە.

٧- ڕێزگرتنی نوێنەری دوژمن و، خراپ نەکردن بەرامبەریان.

٨- پارێزگاریکردن لەسەر نهێنی و، پیلانەکانیان و، جوڵاندنی سوپا.

٩- نیشان دانی هێزی سوپاکەی بۆ دوژمن بە ئامانجی ناردنی پەیامی بەتوانایی سوپاکەی بۆ دوژمن.

١٠- بەرچاو ڕونی و، خوێندنەوەی خێرا بۆ پاراستنی بەردەستەکانی.

١١- پەنابردن بۆ ڕاوێژ و، بەدواداچون بەر لە بڕیاردان.

١٢- دادگەری لە دابەشکردنی ئەرک و، مافەکان بەسەر بەردەستەکانی.

١٣- پیادەکردنی سزادان بەرامبەر هەرکەس سەرپێچی کرد. دور کەوتنەوە لە سزای بژێوی خێزان و، مندالّی سەرپێچیکار.

١٤- خوگرتن بە ئارامگریی و، دورکەوتنەوە لە بڕیاری هەڵەشە و، بە پەلە.

١٥- پارێزگاری لە ئاین و، بیرو باوەڕ و، ڕەوشتی سەربازەکانت.

١٦- سوکایەتی نەکردن بە پیاوانی ئاینی و، پارێزگاری کردن لە کەلو پەری کەسانی دیکە.

١٧- ناپاکی نەکرد و، پەیمان نەشکاندن.

١٨- دەست درێژی نەکردن بۆ سەر و، ماڵی ئەوانی دیکە بە ناڕەوا و، ستەمکاری.

١٩- بڵاو کردنەوەی دادگەری و، دورکەوتنەوە لە ستەمکاری و، زیادە ڕۆیی کردن لە جەنگکردن.

٢٠- هەموو کەس بە پێی توانای خۆی مافی پێ بدرێت.

٢١- هاوسۆزی و، پەیوەندی توند لەگەڵ تەواوی بەردەستەکانت و، گوێ بۆگرتنیان.

# دەروازەی سێیەم

## هۆکارەکانی جیاکردنەوە و، دابەشکردنی تاکەکان بەسەر هێزە چەکدارەکان

## پێشەکی

جیاوازی ژینگەیی و، تایبەتی تاکەکان بەپێی کەسێتی و، دەروونییان جیاوازی هەیە، تاکەکان سەرەڕای بونی تایبەت مەندی مرۆیی گشت، بەڵام زۆر و، کەمیی هەیە لە بونی ئەو توانا جەستەییە تایبەت بەخۆیان و، بەهۆی کاریگەری بۆماوەییەوە یان ژینگەیی یان کاریگەری ئەو دوانە لەسەری توانایان جیاوازە و، هەریەکە تایبەت مەندی دەروونی خۆی هەیە، تەنانەت سەرجەم ڕوکەشییە جەستەیی و، جوڵەیی و، هەستی و، عەقڵی و، کۆمەڵایەتیەکان کاریگەری خۆیانیان هەیە.

لە ڕوانگەی جەستەییەوە جیاوازی زۆر هەیە لە ڕوانگەی درێژی و، کێش و، قەبارە و، ماسولکە و، هێزی جەستەیی، لە ڕوانگەی هەستەکانەوە تاکەکان هەستەکانی بینین و، بیست و، چەشتن و، بەرکەوتنیان، جیاوازە و، هەستەوەریان یەکسان نییە،

**هەندێك لەتاکەکان لەڕوانگەی کۆمەڵایەتییەوە، خاوەنی توانا و، وزەیەکی باشە و، هەندێکی دیکەیان ئەو توانایان نییە، هەندێك لەتاکەکان لە ڕوانگەی عەقڵییەوە جیاوازن لە کەسانی دیکە کە خاوەنی ئەو توانا عەقڵییە نین، هەندێکیان توانای داهێنانیان هەیە، هەندێکیان گەشبین و، هەندێکی دیکەیان ڕەشبینە.**

## تایبەتمەندییە تایبەتەکان:

**تایبەت مەندییە تاکییەکان، بە پێی پسپۆڕیان بەم شێوەیەی خوارەوە جیاوازیان هەیە:**

**یەکەم: ئارەزوی سەلماندی ڕێژەیی: جیاوازییە تایبەتیی و، توانا مرۆیەکان بە پێی کەسێتی و، تایبەت مەندییەیکانیان یەکتری ناچن، هەندێك پەسن هەیە خاوەنەکەی پێ دەناسرێتەوە، هەرچۆن بێت بە ئەندازەی تایبەت مەندییە کەسییەکان جیاوازیی زۆری هەیە، ئەویش بەهۆی ئەو کاریگەرییە ژینگەیی و، ڕۆشنبیریەی هەیەتی دەستکەوتەکانی دەگۆڕێت.**

**دووەم: وەرگرتنی ڕوکەشییە جیاوازەکان: وەك پێشترباسمانکرد جیاوازییە تاکییەکان لەسەر جیاوازی دەروون کورت هەڵنەهێنراون، بەڵکو سەر دەکێشێت بۆ سەرجەم جۆرە**

**عەقڵی و، جوڵە و، جەستەیی و، کۆمەڵایتی و، ڕەوشتی و، کاردانەوەکان.**

**سێیەم: دابەشکردنی دادگەریانە: لەگەڵ بەبەرداکردنی هەر تایبەت مەندییەك کۆمەڵایەتی یان چالاکییەکی دیکە گونجاندێك هەیە لە نێوان کەسەکاندا و، بەپێی تایبەت مەندییەکانیان بە ڕێژەیەکی مام ناوەند بونی هەیە، یان لای کەسانی دیکە زۆر بە کەمی بونی هەیە. تایبەت مەندییە کەسییەکان ڕێژەیی (نسبی) یە، نەك ڕەهایی، بۆ نمونە بونی ئاستی زیرەکی بەشێوەیەکی ڕێژەیی بونی هەیە لە لای تاکەکان و، هەموو کەس خاوەنی زیرەکییەکی تایبەت بەخۆیەتی ئیدی ئەو زیرەکییە کەم و، زیادی هەیە.**

**چوارەم: گشتاندنی جیاوازییە تاکییەکان: جیاوازییە تاکییەکان لای گروپێکی تایبەتی خەڵك بونی نییە و، لای کۆمەڵێکی دیکە بونی نەبێت، بە پێی جیاوازی گەلان و، ڕەگەز و، کلتور و، ڕۆشنبیرییەکان جیاوازیان هەیە، هەروەها کاریگەرە بۆ ماوەیی و، ژینگەییەکان لەبەرچاو دەگیرێت.**

**پێنجەم: سروشتی هەرەمی بۆ جیاوازییە تاکییەکان: توێژینەوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن جیاوازییە تاکییەکان لە تایبەتمەندییەکانی مرۆڤدا بەشێوەی هەرەمی دابەش دەبن،**

تايبەت مەندييە بەربڵاوەكان هەميشە لە لوتكەی ئەو هەرەمەدان، وەك لەتايبەت مەندييە لاوەكی و، نەناسراوەكان، بۆيە دەبينين جياوازييەكانی ژێری لە لوتكەی ئەو هەرەمەدان و، دواتر ئەو پەسنانەن كەمتر گشتگير و، بەربڵاون وەك توانا پيشەييەكان و، ميكانييەكان.

## هۆكارە كاريگەرەكانی جياوازی تاكی:

يەكەم: كاريگەری بۆماوەيی: بۆماوەيی بريتييە لە كۆمەڵێك جينات و، بۆماوەيی لەباوكەوە بۆ منداڵ دەگوازرێتەوە، هەموو تاكێك ئەو شتە بۆماوەيانەی لەباوانەوە دەستيان دەكەوێت جياوازن، جگە لە دوانەی لێكچوو، كاتێك باسی توخمە بۆ ماوەييەكان دەكەين دەتوانين بيگەڕێنينەوە بۆ توخمێكی ئاوێتەيی، ئەو جيناتانە بەهۆی كاريگەری چەند كرۆمۆسۆنێكی جوت دانەيی بەرهەم هاتووە، ژمارەی كرۆموسومەكان لە خانەی مرۆڤدا بريتييە لە (٤٦) كرۆموسۆن.

دووەم: لە ڕوانگەی دەروونييەوە ژينگە كاريگەری خۆی هەيە، واتە لەساتی لەدايك بونيەوە تا كاتی مردنی كاريگەری خۆی لەسەر كەسەكان هەيە، باسی لايەنی جوانی ژينگەيی ناكرێت، بەڵكو باس لە لايەنی كردەيی و، زۆربەی ژينگەكەی

دەكرێت، واتە ژینگەی چالاك كاریگەری تایبەت بەخۆی هەیە لەسەر لایەنی فیزیكی شتەكان، ئەو ژینگانەش بریتین لە:

١- ژینگەی خانەیی: ئەو ژینگەیە كاریگەری لەسەر ئەو خانەیە دەبێت دەگۆڕێت بۆ خانە بنەڕەتییەكانی كۆرپەلە و، بنچینەكانی جەستەی تاك بەدی دەهێنن.

٢- ژینگەی منداڵدان: ئەو ژینگەیە كە لەناو منداڵدان بونی هەیە، دەكەوێتە ژێر كاریگەری دەرمانە بەكارهاتووەكان لەلایەن دایكییەوە، یان ئەو ڕژێمە خۆراكیەی دایكەكە گرتویەتییەبەر.

٣- ژینگەی كۆمەڵایەتی: مەبەست پێی ئەو كاریگەرییە مرۆییانەیە لای منداڵ بونی هەیە.

٤- ژینگەی سروشتی: سەرجەم ئەو كاریگەری و، گۆڕانكارییە سروشتیانەی، وەك: گەرما و، شێ و، كەش و، هەوا دروستی دەكەن، دەگرێتەوە.

## جیاوازییە تاکییەکان لە ناو هێزە چەکدارەکاندا :

ئەگەر سەیری سەربازەکانی یەکەیەکی سەربازی بکەین، دەبینین لە ئاستی سریە یان فەوج، هەمیشە بالاّ ناوەند و، جەستە ناوەندەکان لە ڕیزی پێشەوەن، یان لەڕوانگەی ژێرییەوە ئەوانەی ئاستی ژێرییان مام ناوەندە لە پێشەوەن، یان ئەوانەی لە ئاستی کێشدا وەك یەکن و، مام ناوەندن بە یەکەوەن و، لە پێشەوەن، یان هەستەکانی وەك بینین بیستن، ئەوانەی ئەو دوو هەستەیان وەك یەکن بەیەکەوەن.

ئەمە وەك جیاوازییە تاکییەکان، واتە جیاوازی بونی هەیە لەناو تاکەکاندا بە ئەندازەی جیاوازی بالاّ و، کێش و، هەستەکان یەکەکە دابەش دەکرێت.

## گرنگی توێژینەوە لە جیاوازییە تاکییەکانی ناو هێزە چەکدارەکان :

ئەگەر سەیری هەستیاری هێزە چەکدارەکان و، سروشتی ئەرکە گرنگەکەیان بکەین لەکاتی جەنگ وئاشتیدا، ئەوە

## لیوای یەکی پاراستنی سلێمانی

پێویستە زیاتر گرنگی بدەیت بە ئاستی وەرگرتن و، بە سەربازگرتنی ئەندامانی هێزە چەکدارەکان، چونکە سەرکەوتنی هێزەچەکدارەکان پەیوەستە بە پڕۆسەی بەسەربازگرتن و، دابەشکردنیانەوە، لێرە بۆمان دەردەکەوێت بابەتی تایبەت مەندی و، پەسنەکانی جیاوازییە تاکییەکان خاڵی سەرەکییە و، پێویستە ڕەچاو بکرێت، چونکە پرۆسەی جیاکاری و، دابەشکردنی تاکەکانی ناوهێزە چەکدارەکان پڕۆسەیەکی پێویستە.

تەنها بە جیاکاری پیشەیی و، پسپۆڕی پڕۆسەی جیاکاری لەناو سەربازەکان کۆتایی نایەت، بەڵکو پێویستی بە شیکاری سروشتی ڕۆڵی تاکەکان و، پیشەی سەربازییەکان و، دیارکردنی پێویستییە سەرەکییەکانی یەکەکە هەیە، بۆ ئەوەی کەسی گونجاو لە شوێنی شیاوی خۆی دابنێین. جیاکاری و، شیکاری پیشەی سەربازەکان لەمیانەی تێبینی کردنی تەمەنی سەربازەکان دەردەکەوێت، بۆ ئەوەی سروشت و، پێکهاتە و، پێویستی وپێویستبون و، ئەرك وبەرپرسیارێتی بۆ سەربازەکان دیاری بکەین، هەروەها سروشتی توانا و، ئامادەکاری گونجاویشی دەوێت.

## ئامێرەکانی یەکەی پێوانەی دەروونی :

ئەم بەشەی بە چەند زانستێکی لێکدراو ئەنجام دەدرێت، کە ڕاستی و، وردی تیا بەرجەستە بکرێت، بەڵام بۆ دەستکەوتنی ئەنجامی توێژینەوەکان توێژەران پشت بە بەداگرتن دەبەستن، بۆ ئەوەی ژمارە پێوانەییەکانی وەك درێژی و، پانی و، قەبارەکان بەوردی بپێورێت.

دەروونناسی بۆ پێوانە و، بەبەرداگرتنی یەکە پێوانەییەکان پشت بە پرۆسە زانستییەکان دەبەستێت لەسەر مرۆڤ. ئەو یەکە پێوانەییەك وەك هەر زانستێکی پێوانەیی درێژی و، کێش و، گەرمی پێو و، ئامێری پێوانەیی پەستان ئەویش دەپێون، لە دەروونناسیدا زۆر پێوانە و، ئامێری تایبەتی هەیە هاوکاری پێوانەی سەردەم تایبەت مەندییەکانی کەسێتی دەکت.

## پۆلێن کردنی یەکەی پێوانەیی ئامێرە دەروونییەکان :

چەند بنەمایەك هەیە بۆ دابەشکردنی رۆڵەکان، هەندێك پەیوەستە بە دابەشکردنی بابەتیانەوە و، هەندێکی دیکە تایبەتە بە دابەشکردنی خودییەوە، واتە پێویستە سەرجەم دابەشکردنەکان بەشێوەیەکی سەربەخۆی لەسەر ویستی توێژەر بونیات نرابێت نەك شیکاری و، ڕاڤەبۆکردن، وەك دانانی ئامێری

کاریگەر بون لەسەر ڕاستی و، دروستی هەڵبژاردەی ژیری و، تەمەڵی، هەندێك ئامێری تایبەتی هەیە بەرامبەر ئامێرە کۆمەلایەتی و، دەستە جەمعییەکان، هەندێك بنەما هەیە لەسەر بەشداری کردنی ڕاستەوخۆی کەسەکان دەور دەبینێت، هەندێکی دیکە لەسەر یەکەی پێوانەی ویست و، ئاراستەکرد و، بەها و، پاڵنەری کەسەکان..

## جۆرەکانی هەڵبژاردنی دەروونی:

دەروونناسان گرنگییەکی زۆریان داوە بە هەڵبژاردنی دەروون دروستی، زۆر ئەستەمە بە تەواوی بتوانرێت دەرئەنجام و، پۆلێنی وردی بۆ بکرێت، بەلام هەرچۆن بێت چەند بنەمایەکی جیاواز هەیە کە دەتوانین لەسەر ئەو بنەمایانە بژاردە دەروونییەکان دیاری بکەیت و، پەسنیان بکەیت، لەو بنەمایانەش هەندێکیان پەیوەستە بە یەکەی پیادەرکردنی بژاردەکانەوە و، هەندێکیان پەیوەستە بە یەکەی پێوانەیی هەڵبژاردنەوە و، یەکێکی دیکەیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەنجام دانی هەڵبژاردنەوە. بەر لەوەی باسی ئەو بژاردە و، دیاریکردنانە بکەین، پێویستە باسی هەندێك هۆکار و، کاریگەری یەکەی پێوانەیی بکەین:

١- توانا:

واتە: توانای ئەنجامدانی هەندێك كار، جا ئیدی ئەو كارانە جوڵەیی بێت یان عەقڵی، مەبەستی ئەوەیە كە تاكە بتوانێت ئەو كارە بكات، هەروەها خێرایی و، كوالێتی كارەكەش دەوری خۆی هەیە، جیاوازی هەیە لە نێوان توانا بەدەست هاتوەكان و، توانا خۆ ڕستكەكان. واتە تاك بتوانێت بەبێ ئەوەی هیچ ڕاهێنانێك بكات ئەو كارە ئەنجام بدات، وەك توانای نوسین یان توانای وێنە كێشان.

٢- خۆ سازدان، خۆ ئامادەكردن:

بەكارهێنانی تەواوی ماتە وزەی تاك بۆ ڕاهێنان و، بەدەستهێنانی كارێك، بەڵگەیە لەسەر توانای تاك كە بەڕاهێنان و، خۆ شارەزاكردن ئەو كارە ئەنجام بدات و، خۆی بەهرەمەند بكات، مەبەست لە توانای سەربەخۆی تاكە، زۆر كەس وشەی بەتوانایی لە جیاتی خۆ ئامادەكردن بەكار دەهێنێت، هەمویشی لەسەر ماتەوزەی كەسەكە وەستاوەتەوە كە پێویستی بە ڕاهێنان و، گەشە پێدان هەیە.

٣- بەدەست هێنان:

پێوانە و، ئەو توانایەیە كە تاك بەهۆی بەهرەمەندی و، ڕاهێنان چنگی دەكەوێت، زۆرجار بەدەست هێنان بۆ ئەنجام و، تاقیكردنەوەیەكە، كەبەهۆی خوێندنەوە بەدەستی دەهێنیت، بەڵام دەروونناسان وشەی پڕۆسێنس پسپۆڕی بەكار دەهێنن بۆ

بەدەست هێنان. بەتايبەت بۆ ئەوەى كەسێك پيشەيەك بەدەست بهێنێت.

٤- بەهرەمەندى:

واتە توانا لەسەر ئەنجام دانى كارێك بەو پەڕى ڕێكى و، گونجاوى، لەگەڵ گونجاندنى بۆ بارودۆخە گۆڕاوەكانى دەروبەر.

## بوارەكانى پێوانەى دەروونى لەناو هێزە چەكدارەكاندا :

پێوانەيى دەروونناسى لە ناوەڕاستى سەدەى نۆزدەيەم هاتە ناو بوارى دەروناسى سەربازييەوە، ئەم دياردە دەروونييە لە ڕوانگەى زانستييەوە لەسەر تێبينى گونجاو دور لە زاراوەى فەلسەڤى و، لەسەر دەستى توێژەران (فيبر و، جالتون و، تيرمان و، كەسانى ديكە) سەرى هەڵدا.

دواى ئەوەى وڵاتە يەكگرتوەكانى ئەمەريكا ساڵى (١٩١٧ز) هاتە ناو جەنگەوە، تەنها بە ڕاگەياندنى جەنگ لەدژى ئەڵمانيا، داواى لە سايكۆلۆژى و، دەرنناسە ئەمەريكييەكان كرد هەموو كۆششى خۆيان بخەنە گەڕ بۆ هاوكارى كردن و، بەهێزكردنى لايەنى دەروونى و، مەعنەوى سوپاى ئەمەريكى، ئەوانيش هاوكارييەكى باشيان پێشكەش كرد لە سەربازگرتن و، ئامادەكردنى سەربازەكان بۆ پەيەندى كردن بە سوپاوە و، تاقيكردنەوەى ئاستى نيشتمان پەروەرى و، بەتوانايى و، ديارى

کردنی ئەرکی تاکەکان لە هەواڵگری و، نۆرێنکردن و، هێزە شەڕکەرەکان. بەم شێوەیە بوارەکانیان دیاریکرد:

یەکەم: تواناکانیان. بەم شێوەیە تواناکانیان دابەشکرد:

أ- توانای ژیری.

بۆ ئەوەی ئاستی ژیری دەربخەن پشتیان بە چەند پرۆسەیەك بەست، لەوانە:

- توانای فێربون و، وەرگرتنی چۆنە.
- توانای چارەسەری کێشەکانی چۆنە.
- توانای گونجاندنی دەروونی و، کۆمەڵایەتی چۆنە.
- توانای بیرکردنەوەی چۆنە.

بۆ زانینی ئەم توانایانەش، بەم شێوەیە شکاریان بۆ تاقی کردنەوەکانیان کردووە:

أ- زمان پاراوی: بۆ زانین زمان پاروی، لە دەربڕینی توانای پێدانی زانیاری بە دیاری کراو و، کورتی دەردەکەوێت.

ب- تێگەشتنی زمانەوانی: خۆی لە توانای تاکدا دەبینێتەوە، تا چەند هەست بە مانای وشەکان و، جوانناسی وشەکان دەکات و، توانای تێگەشتنی لە دەر بڕینەکان هەیە.

ت- توانای ژمارەیی: خۆی لە توانا و، خێرایی و، وردی پڕۆسەی ژماردندا دەبینێتەوە.

پ- توانای جێگەیی: خۆی لە توانای پەیوەندی ئەندازیاری و، جێگەیی و، چۆڵەوانییەکان دەبینێتەوە.

ج- زیرەکی پەیوەندی: خۆی لە هەستکردن بە پەیوەندییە دوانییەکانی نێوان تاك و، ژمارەکان دەبینێتەوە.

ح- هێزی بەڵگە هێنانەوە: توانای خوێندنەوەی ڕوداوەکان، بۆ گەیشتن بە بنەما گشتییەکانی دەبینێتەوە.

خ- توانای هەستیاری: خۆی لە خێرایی چالاکی و، بەهرەمەندی و، زانینی شێوە جۆراو جۆرەکان و، دیارکردنی هاوشێوەکان و، جیاوازییەکان دەبینێتەوە.

د- توانای میکانیکی: خۆی لە مامەڵەکردن لەگەڵ شتە مادییەکان دەبینێتەوە.

س- تواناى بيركارى زانى: خۆى لە ئەنجامدانى پرۆسەكانى بيركارى و، بابەتەكانى جەبر و، ئەندازيارى و، تيۆريە ئاڵۆزەكان دەبينێتەوە.

چەندين پرۆسە و، دەست نيشان كردنى ئاستى زيرەكى هەيە كە دەتوانى بەكاريان بهێنيت بۆ دەرخستنى ئاستى زيرەكى لاى تاكى هێزە چەكدارەكان، هەندێك لەو تاقيكردنەوانە كۆمەڵين، ئەتوانيت بەسەر كۆمەڵێكدا پيادەيان بكەيت، لە هەمان كاتدا هەندێكى دكەيان تاكييە و، تەنها بەسەر تاكەكاندا پيادەى دەكەيت.

ئەوەى پەيوەستە بە چۆنێتى وەڵام دانەوەى ئەم تاقيكردنەوانەوە، هەندێكيان پەيوەستە بە تاقيكردنەوەى زارەكييەوە، هەندێكيان پەيوەستە بە تاقيكردنەوەى نوسينەوە، هەندێكى ديكەيان پەيوەستە بە پرۆسەى كردەييەوە. لەو نمونانەى دانراون بۆ تاقيكردنەوەى زيرەكى بريتين لە:

١- تاقيكردنەوەى (ستانفورد) بۆ دەرخستنى زيرەكى:

توێژينەوەيەكى درێژ و، برشتە، لە سەرە تاقيكردنەوەى زيرەكى، كە دەروونناسى فەرەنسى (بينيه) ساڵى (١٩٠٥) پێى هەستاوە. (تيرمان)ى دەروونناسى ئەمەريكى ساڵى (١٩٣٧)

**گەشەی پێداوە و، بەرەو پێشی بردووە و، هەندێك بڕگەی لێ لابردووە و، هەندێك بڕگەی بۆ زیادکردووە، ئەم تاقیکردنەوەیە بو بە (٥٩)بڕگە و، بەسەر ئاستەکاندا دابەشکراوە، هەموو ئاستێك بڕگەی تایبەت بۆ تاقیکردنەوەی دانراوە بە پێی ئاستی بەزریان گرانتر دەبێت. هەندێك بڕگەی تیایە پێویستی بە وەڵامدانەوەی زارەکییە و، هەندێك بڕگەی تیایە پێویستی بە تاقیکردنەوەی نوسینە. ئاستی زیرەکی تاکەکان لەسەر ئەو تاقیکردنەوەی بەندە:**

**پلەیە زیرەکی = (تەمەنی عەقڵی / تەمەنی کاتی) (١٠٠٪) ئەم تاقیکردنەوە لە ناو تاقیکردنەوە تاکییەکانە، کەسکە خۆی دەڕواتە ناو تاقیکردنەوە و، پێویستی بە کەسێکی ئەزموندار و، بەڕێوەبەرێکە بۆ ڕاستکردنەوە و، ڕێنیشاندانی.**

**٢- پێوەری (وکسلر) بۆ زیرەکی:**

**ئەم پێوەرە لەلایەن زانای دەروونناسی ئەمەرکی (دیڤید وکسلر) ساڵی (١٩٣٩) نەخشە سازی بۆ کراوە و، دامەزراوە، دواتر سێ جاری دیکە گەشەی پێدراوە ئەوانیش:**

**أ- تاقیکردنەوەی زیرەکی پێگەیشتوان.**

**ب- تاقیکردنەوەی زیرەکی خوێندکاران.**

ج– تاقیکردنەوەی زیرەکی بۆ قۆناغی بەر لە قوتابخانە.

تاقیکردنەوەکەی (وکسلر) بۆ پێگەیشتوان لە چوارچێوەی ئەو تاقیکردنەوە تاکیانەدا بۆ شیکاری تاك بەکاردێن، دەبنە دوو بەشەوە، یەکێکیان زارەکییە و، ئەوشی شەش تاقیکردنەوەی تیایە بۆ پێوانەی توانا تێگەیشتنە گشتییەکان و، زانیاری گشتی و، بەڵگە هەستییەکان و، لێکچون و، زاراوەکان و، دوبارەکردنەوەی ژمارە. بەشەکەی دیکە پیادەکردنە پێنج تاقیکردنەوە بۆ پێوانەی تواکان وەك کۆدی ژمارەکان و، تەواوکردنی وێنە و، نەخشاندنی میکانۆ و، کۆکردنەوەی شتەکان و، ڕێکخستنی وێنە.

ئاڕاستەکردنی ئەم تاقیکردنەوانە بۆ دیاریکردنی ئەنجامدانی ئەو شتانەی کە پەیوەستە بە شیکاری ئەنجام و، ڕاستکردنەوەوە هەیە. بە پێی دیاریکردنی دەر ئەنجای تاقیکردنەوەکان ئاستی زیرەکی دیاری دەکرێت، واتە هەر تاکێك بە ئەندازەی ئەو وەڵامانەی دەدیاتەوە و، دروستیر کردوە ئاستی زیرەکی دیاری دەکەین لەناو هاو تەمەنەکانیدا.

ب– تواناکانی دیکە:

جیاواز لە دیاریکردنی جیاوازییە تاکییەکان، تاکەکانی هێزە چەکدارەکان توانای ژیریان هەیە، چەند توانایەکی دیکە هەیە ئەتوانی تواناکانیان بپوێویت، ئەمیش بەم شێوەیەیە:

أ- توانای هێزی ئاگایی: دەرخستنی توانای تاکەکانی هێزە چەکدارەکان بۆ زیادرکردنی کۆبیریان. ئەمیش ماوەیەکی دیاری کراوە بۆ ئەوەی بزانیت توانای کۆبیر (الترکین)ی ئەو کەسە چەندە.

پێوانەی ئەم توانایەش لەمیانەی ئامێرێکە بەناوی (تاکسو سکوب) کە لە میانەی چەند کارتێکی وێنەدار دەردەکەوێت بازنەی خڕی تیابێت و، جیاوازییەکی زۆر کەم لە ناو کارتەکاندا هەیە، بە پێی دۆزینەوەی جیاوازییەکان خاڵ وەردەگرێت.

ب- توانای دەستەکان: ئەمەش لە میانەی توانای تاکەکانی هێزە چەکدارەکانە بۆ بەکارهێنانی دەستەکان بۆ ئەوەی بزانیت توانای بەکارهێنان و، خێرایی و، هێزیان چەندە، لە جێگیر کردنی شتەکان و، ڕاکێشان و، شکاندن و، فڕەدان و، بەرزکردنەوە.

ج- جوڵەی هەستی: لە توانای هاودەنگبون لە نێوان توانا هەستی و، جوڵە ماسولکەییەکان لە کاتی جێبەجێکردنی ئەرکێك

بەدی دێت. ئەویش لەکاتی تەقاندن و، هەڵدانی شتێکە بۆ نیشانەیەکی جێگیر یان جوڵاو و، دیاری کردنی پێوانەکەی و، ڕاکردن و، بازدان بەسەر بەربەستەکان و، سوڕانەوە.

د- توانای ئەنجامدانی کاری ورد و، گشتی: ئەویش لە توانای ئەنجامدانی کارە میکانیەکیە وردەکان ئەنجام دەدرێت، کە پێویستی بە جوڵەی هەستیی ورد و، بەرهەمەندی و، کۆبیر و، بەئاگایی و، ڕێکخستنی جوڵەی دەست و، پەنجەکانە، هەروەها کاری دیکەی کە پێویستی بە هەڵگرتنی تەنەکانە.

هـ - توانا هەستییەکان: توانای هێزی هەستەوەرە جیاوازەکانی مرۆڤە لای ئەندامانی هێزە چەکدارکان، ئەویش لە هەستی بینین و، بیست و، بۆن کردن و، چەشتن و، بەرکەوتن خۆی دەبینێتەوە. لەکاتێکدا زۆرترین ئەو هەستانەی شیاوی گرنگی پێدانن هەستی بینین و، بیستنە.

## خستە ڕووی هەندێك لایەنی هەستی کە ئەتوانی ئەندامانی هێزە چەکدارەکانی پێ هەڵسەنگێنیت:

١- تیژ بینین: لە توانای گونجاوی بینین و، جیاکردنەوەی شتەکان و، ئامانج و، کەرەستەکان خۆی دەبینێتەوە. یان شیاوی بۆ بینینی شەو و، جیاکردنەوەی شتەکان لەیەك و، ئەنجامدانی

ئەرك و، جوڵەکانی شەو، لێخوڕینی ئۆتمبیل بەبێ گڵۆپ، جیاکردنەوەی شوێن و، ئامانجەکان.

٢- خێرایی لە هەستکردنی بینین: بە خێرایی و، وردی هەست بە تێبینیەکان بکەیت و، شتەکان لەیەك جیا بکەیتەوە. ئەم توانایە بۆ ئەو کرێکارانە زۆر گرنگە کە لەبوارەکانی نۆرین و، نیشانە گرتن و، ڕادالْ و، چەکی دژی فرۆکە زۆر پێویستە.

٣- جیاکردنەوەی ڕەنگەکان: بۆ دەرخستنی ئەوانەی نەخۆشی کوێری ڕەنگیان هەیە، هەروەها توانای جیاکردنەوەی ڕەنگەکان لەیەك بەتایبەت ڕەنگە نزیکەکان.

٤- دوربینی: ئەمیش لە بواری بینین درێژدا خۆی دەبینێتەوە، بۆ دیارکردنی ئەوانەی توانای بینین دوریان هەیە. تاکەکان جیاوازیان هەیە بۆ سەیرکردنی جێگەیەك، هەندێکیان تەنها بە یەك ئاوڕدانەوە توانای بینینی زۆر شتیان هەیە، لە کاتێکدا زۆری دیکە پێویستی بە کۆبیر و، چاو تێبڕینە بۆ بینین شتەکان.

٥- توانای بیستن: ئەمەش بەهۆی بیستنی تاکەکان دەردەکەوێت کە جیاوازی لە ئاستی بیستندا هەیە لەناو هێزە چەکدارەکاندا، ئەوانیش:

أ- سوکی بیستن: لە توانای بیستنی دەنەگی زۆر سوکدا خۆی دەبینێتەوە.

ب- زو هەستکردنی بیستن: لە خێرا بیستن و، هەستکردنی بە مانای ئەو شتە و، دژەکەی و، دەربڕینە وشەییەکان دەبینێتەوە.

ت- جیاکردنەوەی دەنگەکان: ئەمیش لە توانای جیاکردنەوەی جەنگی مرۆڤ و، ئەو دەنگانەی کە لە ئەنجامی شتی دیکە دەر دەچن، یان جیاکردنەوەی جەنگی فیشەکەکان و، فرۆکەکان و، جۆری دورهاوێژەکان، جۆری ئۆتۆمبیلی سەربازی.

پ- دەرکی بیستن: لە توانای هەستکردنی بە مانا و، دەنگەکان لەکاتی بونی ژاوە ژاوی زۆر خۆی دەبینێتەوە.

دووەم: لایەنی کەسی (میزاجیبون و، هەڵەشەیی):

ئەمەش لە ناو ئەوانەی کە توانای ئاوازی و، جەستەییان هەیە، چونکە جیاوازی هەیە لە ڕوانگەی ڕەوشتی و، هەڵچونەکانی ئەندامانی هێزە چەکدارەکان.

ناسینی کەسەکان بەهۆی سیفەتەکانیانەوە زۆر پێویستە بۆ بەدی هێنانی ئامانجەکانی هێزەچەکدارەکان، ئەمیش لەکاتی

ڕاهێنان و، پرۆسەی دابەشکردنی تاکەکانو ئەرکە جیاوازە سەربازییەکان دەردەکەوێت، یان لەبواری پاراستنی تاکەکان وکاریگەر بونیان، یان بەهۆی ئاراستەکردنی دەروونی و، پیشەیی و، مەعنەوی.

چەند تاقیکردنەوە و، پێوانەیەك هەیە کەدەتوانیت تایبەت مەندی و، ڕەوشتە جیاوازەکانی ئەندامانی ناو یەکە چەکدارەکانی پیّ پۆلێن بکرێت، ئەم پێوانەیەش پشتی بە سروشتێك بەستووە کە لە پێناوی نەخشاندویانە. ئامانج لە هەندێك تاقیکردنەوەی پێدانی وێنەی گشتی کەسایەتییەکە، لە هەمان کاتدا هەندێکی دیکە بە شێوەیەکی دیکە کار دەکەن بۆ دیاری کردنی کەسێکی دیاری کراو. بەڵام بەگشتی ناسینی کەسەکان پێویستی بە ڕاهێنەری بەتوانا و، کەسانی خاوەن ئەزمونە بۆ ئەوەیش شکاری تەواوی بابەت و، لایەنە تایبەتییەکانی ئەو کەسە بکات.

دەروونناسان چەند هۆکارێکیان داناوە بۆ دەرخستنی کەسایەتییەکان و، ڕەهەند و، پەسن و، تایبەت مەندی و، پێوانە و، تاقیکردنەوەی کەسایەتییەکان، ئەتوانین کەسایەتیەکان بەم شێوەیە هەڵسەنگێنین:

١- یەکەی بابەتی: لە یەکەی پێوانەیی و، هەڵسەنگاندنی خود خۆی دەبینێتەوە، ئەمیش چەند داوایەکی هەیە کە پێویستە بۆ ئەنجام دانی تاقیکردنەوە، ئەویش: بە ڕاست و، هەڵە، یان بە دیاری کردنی ئامێری پێوانەیی کەسایەتی وەك: فۆڕمی ڕاپرسی و، ئەنجامدانی کاری کردەیی.

٢- هۆکاری خستن: ئەویش ئامێرێکە بۆ تاقیکردنەوەی ئازادی ڕادەبڕین لە بەرامبەر چەند هەڵوەستەیەکی نادیار و، ناڕون، بۆ دیاریکردنی هەست و، پێویست و، ویستەمەنی داواکارییەکان.

## ئامێرەکانی تاقیکردنەوە و، یەکەی پێوانەی دەروونی لە ناو سوپادا:

أ- تاقیکردنەوەی ئەوانەی شیاون بۆ کارکردن: بە تاقیکردنەوەی دەروونی دیارکردنی سەربازەکان و، پاڵێراوانی ناو قوتابخانە سەربازییەکان دەبێت، دورخستنەوەی کەسە سەرکەوتوو نەبوەکان لەو پرۆسەیە، تاقیکردنەوەی زیاتر بۆ ئەوانەی سەرکەوتون.

ب- بەکارهێنانی تاقیکردنەووەی دەروونی، هەروەها پۆلێنکردن لە نێوان سەرکەوتواندا، هەڵبژاردنی کاری پێویست بۆ هەر ئەندامێکیان.

ت- تاقیکردنەوەی کەسە سەرکەوتووەکان: هاوکاری دەروونی ئەوانە دەدات کە سەرکەوتوبوون، هەروەها ڕاهێنانی زیاتر و، دورخستنەوەی ئەوانەی کە توانای ڕاهێنانیان کەمترە.

س- بەکارهێنانی یەکەی پێوانەیی دەروونی وەك هۆکارێك بۆ تەواوکردنی تاقیکردنەوەکان و، بەرزکردنەوەی ڕاپۆرت و، تێبینی بابەتیانە و، تاقیکردنەی تاکەکان کە ئامادەکاریان کراوە بۆ ڕاهێنان و، هەستان بەکاری دیاری کراو، دیاریکردنی ئەوانەی کە توانایان بەرزترە لەو تاقمەی کە هەڵبژێراون.

ج- دیارکردنی پێویستییەکانی ڕاهێنان: بۆ دیاریکردن و، زانینی تاقیکردنەوە دەروونییەکان بەکار دێت، بۆ ئەوەی هەڵسەنگاندنیان پیێ بکەیت بەر لەوەی بڕۆنە ناو ڕاهێنان.

ح- ڕاسپاردە کردن و، ئاراستەی دەروونی: بۆ شیاوێتی و، ئامادەمکردن و، دەرخستنی کێشە دەروونیی و، سۆزدارییەکان بەکار دێت، بۆ ئەوەی توانای چارەسەری دەروونی گونجاو پێشکەش بکەیت.

# توێژینەوە لەسەر جیاوازییە تاکییەکان و، خزمەتکردنیان لە بوارەکانی ناو هێزە چەکدارەکان:

## یەکەم: پڕۆسەی ڕاهێنان:

پڕۆسەی دیاریکردنی جیاوازییە تاکییەکان هاوکاری باش دەکات، بۆ ئامادەکردنی تاکەکان بۆ ڕاهێنان، وەك جیاوازییە جەستەیی و، عەقڵی و، کاردانەوە و، جوڵەکان لە ناو ئەندامانی هێزە چەکدارەکاندا. ئەنجامدانی بەرنامەی ڕاهێنان و، جۆرێتی دەبێت گونجاو بێت بۆ ئەو جیاوازییە ئاستیانەی کە لە ناو تاکەکاندا بونی هەیە، چونکە کاتژمێرەکانی ڕاهێنان بە پێی ئاستی جیاوازی توانا و، شیاوێتی دەبێت بگۆڕدرێت و، شیاو بن.

واتە: جیاوازییە تاکییەکانی ناو هێزەچەکدارەکان، لە توانایدایە کە بەشداری پێ بکەیت بۆ هەڵسەنگاندنی ئەو کەسانەی کە خاوەنی تایبەت مەندی بەخۆیانن و، گونجاون بۆ ئەو ڕاهێنانە، ئەویش بە داڕشتنەوەی بەرنامەیەکی گونجاو و، ئەو کاتژمێرانەی کە دیاری کراون بۆ ڕاهێنان لەسەر گشت ئاستەکان.

## بنەما دەروونییەکان بۆ ڕاهێنانی دەروونی:

**ڕاهێنانی سەربازی چەند بنەمایەكی هەیە، لە چەند خاڵێكدا كۆیان دەكەینەوە:**

**أ- ڕێگە گشتی و، بەشییەكانی ڕاهێنان:**

**لێرەدا پرسیارێك درسوت دەبێت، یەكێك لەو كارە گرنگانەی بۆ ئەنجامدانی ڕاهێنان ئەیگرنەبەر، كامیان باشترە ڕێگەی گشتی، یان ڕێگەی تایبەتی؟ ڕێگەی بەشی ئەو ڕاهێنانانەن كە یەكەكە فێری دەكات لە میانەی وتنەوەی وانەكان لەلایەن مامۆستاكانی یەكەكەوە، ئەمیش بەهۆی ئەوەی بڕێكی زۆر زانیاری دەبەخشێت بە سەربازەكە.**

**ب- سەربازەكەت چی فێربووە؟**

**زانین ئەوەی كە ڕاتهێناوە فێری چیبوە، باشترین هۆكارە بۆ دەستكەوتنی دەرئەنجام، بۆ ئەوەی سەرباز بەڕێگەیەكی دروستی سەربازیدا بڕوات نەك بە ڕێگەی چەوت و، هەڵە. ئەم زانینەش بە دەرئەنجامی ڕاهێنانەكە دەبێت بزانیت چی فێربووە، چونكە ئەگەر سەرباز فێری هیچ نەبێت ئەوە ڕاهێنان توشی ڕەشبینی و، بێزاری دەكات، چونكە كاركردن وا لە سەرباز دەكات كە بەردەوام لە هەنگاونان بێت بۆ باشتر و، دڵكاری.**

هەروەها ئەو سەربازە ڕاهێنراوە بەردەوام لە كۆششدايە بۆ ئەوەی كێبەركێی ئەوانی دیكە بكات بۆ باشتربون و، بەرەو پێش چوون. چونكە نەزانین ڕێگەی ڕاست و، بە هەڵە ڕۆشتن هەمیشە سەرباز توشی ڕەشبینی و، بێزاری دەكاتەوە.

ج- ڕاهێنانی وەرگرتن و، ڕاهێنانی چالاكبوون:

ڕۆڵی ڕاهێنەر و، ڕاهێنراو لە ڕاهێنانی سەربازیدا كارێكی زۆر پەسەندە، هەریەكە لەخۆیان ڕۆڵی بەرچاوی هەیە لە سەركەوتنی كارەكە، بەڵام هەمیشە ڕاهێنەر ڕۆڵی چالاك و، زیندوی هەیە بۆ ئەوەی باشترین پەیامی خۆی بگەیەنێت، هەرچەندە وەرگر دەبێت زیاتر ماندو بێت و، ڕاهێنەر تەنها ڕۆڵی ئاراستەكردن و، پشتیوانی كردنی هەیە.

د- پاڵنەرەكان و، ڕاهێنان:

ئایا فێربون و، ڕاهێنان پێویستی بە پاڵنەرهەیە؟ پرسیارێكە زۆربەی دەروونناسان وەڵامیان داوەتەوە كە بەبێ هاندان زانست سەركەوتو نابێت. یەكێك لەو پاڵنەرانەی كە پێویستە ڕاهێنەری سەربازی تیشك بخاتە سەری و، وابكات سەربازەكەی هان بدات و، ئەوەیە كە ڕاهێنان لای سەربازەكەی خۆشەویست بكات زیاتر سەربازەكان كێبەركێ بكەن بۆ فێربوون.

### هـ – شیاوێتی ڕاهێنان:

پێویستە ڕاهێنەری سەربازی دوو مەرجی بنەڕەتی تیا بێت، یەکەم: دڵسۆز و، دڵکاری و، شارەزایی تەواوی بۆ ئەو کارەی هەبێت کە سەربازەکانی لەسەری ڕادەهێنێت، چونکە ئەوەی هیچی پێ نییە ناتوانێت ببەخشێت، دووەم: کە لەیەکەم گرنگترە ئەویش توانای گەیاندنی زانیارییەکانە بە ئاسانترین و، کورتترین ڕێگە، واتە: گەیەنەرێکی باشی بێت و، زیاتر لەمامۆستایەکی دیکە توانای تێبینی کردنی هەبێت.

### و– دەست کردن بە ڕاهێنان بە ڕێگەیەکی دروست:

پێویستە بە ڕێگەیەکی دروست دەست بکرێت بە ڕاهێنان بۆ ئەنجامدانی کارەکەت، هەروەها پێویستی بە پەرۆشی زۆرە بەتایبەت لە ڕاهێنانی یەکەمدا، نابێت بە هیچ شێوەیەك سەرباز بخەیتە سەر ڕاهێنان و، خۆت سەپەرشتی نەکەیت، چونکە ئەگەر هەڵەیەك بکات و، ڕاست نەکرێتەوە ئەوە ئەستەمە ئەو هەڵەیە ڕاست بکاتەوە و، هەر لەسەری بەردەوام دەبێت، ڕاهێنان لەسەر کەسێکی سەرەتایی کە هیچ نەزانێت لەو زانستە، ئاسانترە لە ڕاهێنانکردن لەگەڵ کەسێك کە پێشتر بە ڕێگەیەکی هەڵە ڕاهێنرابێت.

**ز- سەرەتا وردوبونەوە ، پاشان خێرایی:**

**زۆر چالاکی سەربازی هەیە پێویستە بە خێرایی و، وردی ئەنجام بدرێت، پێویستە لەسەر ڕاهێنەر لەکاتی مەشقدا گرنگی بە وردی بدات و، کۆبیر بخاتە سەرکارەکەی، چونکە ئەم دوو پێکهاتە زۆر پێویستە بۆ جوانکار و، کوالیێتی بەرز لە کارەکانی سەربازدا، بەڵام تیشك خستنە سەر خێرایی، بەر لە وردی ئەوە پێویستی بەوەیە کە سەرباز باشتر لەسەر ئەم کارە ڕابهێنرێت بەر لەوەی بکەوێتە ناو هەڵەوە.**

**دووەم: دابەشکردنی تاکەکان لەسەر پیشە و، ئەرکە سەربازییەکان:**

**دیاری کردنی جیاوازییە تاکییەکان پێویستی بە هێزێکی گەورەی مرۆیی هەیە، ئەویش دانانی کەسی شیاو لە شوێنی شیاودا، پیشەکانی ناو هێزە چەکدارەکان جیاوازن هەمویان بە سروشت سەربازی هەڵنەکەوتوون، هەروەها داواکاری وتواناکانیشیان جیاوازن.**

**سێیەم: بەرزکردنەوەی گیانی مەعنەوی:**

**دابەشکردنی تاکەکان بۆ پیشە و، ئەرك و، کاری خۆیان، بە ئەندازەی شیاوی و، حەز و، ئارەزوی تاکەکان، کاریگەری**

گەورەتری دەبێت و، دەبێتە پاڵنەرێكی باش بۆ ئەوەی كاربكات و، كۆڵنەدەر و، پێداگربێت تا بەدەست هێنانی ئامانجەكەی. ئەگەر سەرباز لە جێگەیەك دابنێیت كە شیاویەت و، ئارەزوشیی دەكات، ئەم دانانە كاردەكاتە سەر ڕێژەی سەركەوتنەكانی و، پاڵپشتی خودی دەبێت بۆی و، گیانی مەعنەویەتیشی لابەرز دەكاتەوە.

چوارەم: بەرزكردنەوەی ئاستی شیاوێتی بۆ جەنگان لەناو یەكەدا:

پڕۆسەی دیاریكردنی ئاستەكان جیاوازن لە تایبەت مەندی و، توانا و، پسپۆڕی تاكەكان، ئەتوانی سود لە هەموو پسپۆڕییەكان ببینیت بۆ ئەوەی بەرنامەیەكی گونجاو دابنێیت بۆ سەركەوتن. ئەمە هەم دیسان كار دەكتە سەر پیشە و، توانا تەكنییەكانی لای تاك و، شیاوێتی بۆ جەنگ.

## تاقیكردنەوەی پیشەیی ئەفسەران:

واتە: تاقیكردنەوەی پیشەیی ئەفسەران، بۆ ئەوەی بزانرێت ئەو ئەفسەرە بۆ چی جێگەیەك گونجاوە و، ئارەزوی كردنی چی كارێك دەكات شیاوی پسپۆڕییەكەی بێت، واتە: دانانی كەسەكان لەو پلەیەی گونجاوە و، لەگەڵ ژیری و، توانا و، ئارەزو و،

کەسێتی دەگونجێت، بۆ ئەوەی ئەو کارە بە باشترین شێوە بگەیەنەتە پایان.

دەروونناسان گفتوگۆیان کردووە بۆ دیاری کردنی پیشە ئەفسەران لە ناو هێزەچەکدارەکاندا و، بەشداری کردنیان بە ئەندازەی پسپۆڕییەکان، بۆ گەیشتن بە باشترین بەرنامە ڕێژی بۆ ئامانجەکەیان.

(ئالان جونز) یەکێکە لەو دەروونناسە ئەمەریکیانەی، گرنگی بە دانانی هەڵبژاردنی پیشە و، پسپۆڕی، بۆ پۆستی ئەفسەران لە ناو هێزەچەکدارەکان داوە.

## (ئالان جونز) پرەنسیپەکانی دانانی ئەفسەر بەم شێوەیە دابەش دەکات:

أ- دەست نیشانکردی ئاستی ئەکادیمی بونی:

ئەمە لەکۆنترین شێوە بەکارهاتووەکانە، فەرەنسا، ئیسپانیا، ولاّتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا و، ڕوسیا لە ناو کۆلێژە سەربازییەکانیاندا ئەم ڕۆڵە دەخوێن و، گرنگی پێدەدەن، هەروەك پێشو گرنگی بە توانای جەستەیی و، دەروونی ڕۆڵی هەبووە لەسەر ئەوەی پسپۆڕانی دەروونی دەست نیشانی بکەن.

## ب- هەڵبژاردن بە بەکارهێنانی تاقیکردنەوە دەروونی:

ئەم شێوەیە لەسەر تاقیکردنەوە و، هەڵبژاردنە جیاوازەکان ئەنجام دەدرێت، وەك دیاریکردنی توانای ژیر کە بە نوسین و، دیاریکردنی هەندێك ئارەزوی ژیانی دەست نیشان دەکرێت، ئەم شێوەیە ئێستا لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا گرنگی پێدەدرێت.

(ئالان جونز) ئاماژە بۆ ژمارەیەك توێژینەوە دەکات کە دانراون بۆ تاقیکردنەوە لەسەر دیاریکردنی زیرەکی، ئەمە لەسەرجەم فەرمانگە سەربازی و، مەدەنییەکاندا یەکسانە. بەرزبونەوەی ئاستی زیرەکی کەسەکە پەیوەستە بەو چەند کار و، پیشەی و، توانایەی هەیەت و، خاوەنی عەقڵ و، ژیرییەکی زۆرە. سەرجەم پیشەکان پێویستی بە مرۆڤی زیرەکە بەتایبەت سەربازی.

## ج- بنەماکانی پێوانەی دەروونی:

شێوەی ئەکادیمی و، شێوەی تاقیکردنەوەی دەروونی کە ئاماژەمان پێدا، زۆر باشبوون بۆ دیاریکردنی قوتابی بۆ کۆلێژە سەربازییەکان، بەڵام ئەم دوو شێوەیە کەم و، کورتیان هەیە لە

**دیاریکردنی کەسە دیارو فەرماندەکان. بۆیە پێویستە کۆلێژەکان کەسی زۆر شیاو و، گونجاو دەست نیشان بکەن بۆ ئەم تاقیکردنەوەیە. هەرچەند ئەمە لە ڕوانگەی تیۆرییەوە زۆر ئاسانە، بەڵام بۆ پیادەکردنی زۆر گرانە.**

# دەروازەی چوارەم

# گیانی مەعنەوی

## پێشەکی

جەنگ وەك دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی، ژمارەیەك کاریگەری زۆر هاوشێوەی لیَ بەجێدەهێڵێت، لەو کاریگەریانە جۆری کەرەست و، پێداویستی و، هاوکاری و، بارودۆخی تایبەتی جەنگاوەران و، سروشتی زەوی و، فەرماندە و، هاوڵاتیش دەگرێتەوە، گرنگترین خاڵەکانیش بریتییە لە بەجیَ هێشتنی کاریگەری لەسەر مرۆڤایەتی، کاریگەری تەواو دەکاتە سەر تایبەت مەندییە کەسییەکانی وەك ئازایەتی و، بڕوا و، پێداگری لەسەر جەنگ.

هەڵبژاردنی پیشەیی بونی سەربازەکان تەنها بۆ جەنگ نییە، بەڵکو بۆ ڕاهێنانە لەسەر چەك و، بابەتە سەربازییەکانی دیکە و، لە هەموشی گرنگتر خۆڕاگرییە لەسەر زەوی جەنگ و، نەبزوتن و، خۆ نەچەماندنەوەیە لە کاتی ناخۆشییەکاندا.

شارەزایانی بواری جەنگ و، پسپۆڕانی بەشداربوانی جەنگ ئاماژە بەوە دەدەن کە سەرکەوتن و، گەیشتن بە ئامانج بریتییە لە ئاستی مەعنەوی و، پێداگری لەسەر جەنگ. کەلوپەلی جەنگی وەك چەك و، دەبابە و، فڕۆکە تەنها ئامێری جەنگین پیشەکەیان بە وزەی مرۆڤ کار دەکات و، ماتە وزەی مرۆڤ زۆر لەوانە گەورەترە، لەکۆتاییدا ئەوە ویستی مرۆڤە کە جەنگ یەکلایی دەکاتەوە.

ناپلیۆن وتەیەکی ناوداری هەیە: "یەك لەسەر سێی توانای جەنگی بریتییە لە مەعنەوی و، بەهای ماتە وزەی ناخی مرۆڤ" ئەم ورەبەرزی و، ویستە پۆلاینەی مرۆڤ لە فەرماندەوە بۆ خوارەوە دادەبەزێت. چونکە ورەبەرزی توانای ئەوەی هەیە کە سەرکەوتن بەدەست بهێنیت.

تەنانەت لە جەنگی جیهانی دووەمدا ئیتاڵییەکان زوتر خۆیان دەدا بەدەستەوە، هەرچەند سەربازەکانیان زۆر بەباشی ڕاهێنانیان پێکرابوو، کەچی چەکەکانیا فڕەدەدا و، خۆیان ڕادەست دەکرد، چونکە جەنگ نەڕۆشتبووە ناخیان و، لە قوڵایی دڵیانەوە نەدەجەنگان، بەڵام ئەگەر سەیری عەرەبەکان بکەیت هەرچەند کەمتر لە ڕۆم و، فارسەکان ڕۆشتونەتە ناو جەنگەوە، لەگەڵ ئەوەشدا شەڕکەری باشن و، چەندین سەرکەوتنی گەورەی

**مێژویان تۆمارکردووە، هەرچەند دەبینی سوپای ئیسلامی زۆر کەمتر بوون لە سوپای بێباوەڕان، بەڵام توانیان سەرکەوتن بەدەست بهێنن، یان دواتر محەممەد عەبدولکەریم خەتابی کە شۆڕشگێڕێکی مەغریبی بوو بە چەکی سەرەتایی توانی چۆك بە هەرسێ ئیمبراتۆریەتی: (ئیسپانی، پرتوگالی، ئیتاڵی) دابدات و، بیان شکێنێت، ناپلیۆین یەکێك بوو لەو کەسانەی باسی ئەوەی کردووە کە ڕۆحی مەعنەوی و، ورەبزرەی، لە چەك و، تەقەمەنی زیاتر گرنگی بە مرۆڤ دەدات.**

**هەرچەند ناتوانیت ئەو پێشکەوتنە جەنگیانەی ئەمڕۆ لەبەچاو نەگرین، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی مرۆڤ و، دەستی مرۆڤایەتی، گرنگییەکی زۆر گەورەی هەیە لە بەدەست هێنانی سەرکەوتنەکان. بۆیە ڕۆحی مەعنەوی لە پێش هەموو چەکێکەوەیە.**

## پێناسەی ڕۆحی مەعنەوی:

**تاك یان کۆمەڵ یان نەتەوە هەندێك جار بە بارودۆخی زۆر ناهەمواردا تێدەپەڕن، ئەو بارودۆخە توشی کێشەیان دەکات. هەرچەند کۆمەڵگە توشی شکست و، کەوتن و، جەنگی ناوخۆیی ببێت، بەڵام کۆمەڵێکی تیایە کە وەك چیا، لە بەردەم هەموو ئەو**

**ناهەمواریانەدا دەوەستێتەوە و، لەناوی دەبات. چۆن ئەمە ڕودەدات؟**

**یەکێك لەگرنگترین ئەو خاڵانەی، توێژینەوە دەروونییە کۆمەڵایەتییەکان ئاماژەی پیٚ دەدەن: بریتییە لە گیانی مەعنەوی.**

**گیانی مەعنەوی کارەکتەرێکی دەروونییە، کاردەکات بۆ ئەوەی تاك، یان کۆمەڵگە بەرەو سەرکەوتن یاخود شکست ببات، واتە جاری وا هەیە بەهۆی هەڵوەستەیەکەوە کە پێویستی بە خۆڕاگری و، وەستانەوەیە بەرەو سەرکەوتن یاخود بەرەو شکستت دەبات، بۆیە سەرکەوتو ترین کارەکتەری گەیشتنە بە ئامانج.**

**پێناسەی ڕۆحی مەعنەوی واتە: "گیانی هەرەوەزی و، لێبڕاوی بۆئەرك، نەك چینایەتی و، شارچێتی"، ئەم چەمکە بۆ ئاماژەدانە بەوەی کە هەستی خۆشەویستی و، دڵسۆزی بۆ نەتەوەکەت لەناختدا بجوڵێت، یان هەستی یەکێتی نەتەوەکەت لادروست بکات، ئەم هەستە مەرجێکی گرنگە بۆ بەشداری کردنی کۆمەڵ و، پابەندبون پێیەوە. چونکە بەبیٚ ئەم هەستی برایەتی و، یەکبونە ئەگەر نەبوو ئەوە کارەکەیان بەرەو گرانی و، ناخۆشی دەبات و، بەرەو هەڵدێر دەڕۆن. ئەگەر تاکەکان کاریان کرد لەسەر**

پاراستنی ڕۆڵ و، پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەوانی دیکەدا، ئەوە سەرەتای یەکبون و، یەکێتی کۆمەڵەکەیە. مەبەستی ئێمە لەوەیایە کە گیانی گروپ هۆکاری سەرەکی بونیات نانی پەیوەندی هەموو باڵەخانەیەکی بەرزە.

(بونر) بەم شێوەیە پێناسەی ڕۆحی مەعنەوی دەکات: "کە هەموو تاکێك بەرامبەرەکەی وەربگرێت وەك ئەوەی هەیە، ئەوکاتە گیانی برایەتی وادەکات رۆحی مەعنەوی کارەکتەری سەرەکی بێت بۆ پەیوەست بونی کۆمەڵ و، بەهێزبونی". کە کۆمەڵ ڕۆحی مەعنەوی تیابوو، ئەوکاتە زۆر ئەستەمە لەبەر یەك هەڵبوەشێتەوە و، توشی شپرزەیی ببێت، هەروەها ڕۆحی مەعنەوی بەشداری دەکات بە ڕێکخستنی ناوخۆی کۆمەڵ و، جەخت کردنەوە لەسەر یەك ڕەوشتی.

یەکێك لە تایبەت مەندییەکانی ڕۆحی مەنەوی وەستانە لە تەنیشت هاوڕێکەتەوە. بەو مانایەی: تا زیاتر ئەم پەیوەندییە بەهێزتربێت و، کارا بێت، بەها و، چالاکییەکانی ڕۆحی مەعنەوی لە ناو نەتەوەدا بەهێزتر دەبێت، خەڵك لە پێناو نەتەوەکەی دەجەنگێت، چونکە دۆڵسۆزی و، بەپەرۆشە بۆ ولات و، نیشتمان و، نەتەوەکەی، هەموان گرنگی بە پیرۆزییەکانیان دەدەن و،

**خۆشەویستی بۆ دەر دەبڕن، ئەمانەش سوتەمەنی ڕۆحی مەعنەوییە.**

**هەر هێرشێك یان تانە دان لە هەر تاکێك لە تاکەکانی ناو کۆمەڵەکە، کاریگەری نەرێنی لەسەر تاك بەتاکی ئەو کۆمەڵەیە دەبێت. بۆیە ناکرێت جیاوازی بکرێت لە نێوان تاك و، کۆمەڵدا، واتە کەم و، کورتی تاك کەم و، کورتی کۆمەڵەکەیە.**

**ڕۆحی مەعنەوی دیاردەیەکی دەروونییە سەربازەکان بە ورەبەرزی و، پاڵنەرەکانی جەنگی و، هەستان بە ئەرکەکانی سەرشانی خۆیان و، متمانە بەخۆ و، بە فەرماندەکەی دروست دەبێت.**

**هەموو ئەو پێناسانەی ڕابورد لەسەر ڕۆحی مەعنەوی تەنها یەکلایەنی دەگرتەوە، کە لایەنی دەروونییە، هەمویان پەیوەستە بە دەروونەوەیە.**

**بەڵام ڕەنگە پێناسەی گشتگیر بۆ ڕۆحی مەعنەوی بریتییە لە: "هەستێکی دروونییە تاکەکانی ناو کۆمەڵگە پەی پێدەبەن و، بە گرنگی کارەکەیان دەکەن بۆ ڕوبەڕوبونەوەی هەموو ئەوبەربەست و، ئاستەنگانەی دێنە بەردەمیان بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەیان، ئەوانیش بە ئارامگری و، کۆڵنەدان و، هاوکاری و،**

دڵسۆزی لە پێناو نەتووەکەیان ڕوبەڕوی دەبنەوە، بۆ بەرزکردنەوەی بیروباوەڕو بەردەوامی دان بە مێژوی شکۆمەندیان و، پارێزگاری کردن لێی". هەندێك لە دەروونناسان لە جیاتی ڕۆحی مەعنەوی، یەکێتی و، یەکبونیان بەکار هێناوە، چونکە بەو هۆیەوە برایەتی و، هاریکاری و، خۆشەویستی و، دڵسۆزی لە نێو تاکەکاندا دروست دەبێت. ڕۆحی مەعنەوی چەمکێکی دەروونیی کۆمەڵایەتییە، پێناسەی تاك و، کۆمەڵ دەکات بۆ گەیشتن بە ڕێکخستنی خود و، متمانە بەخۆ بون و، بەرنامە ڕێژی بۆ کاتە لەناکاوەکان.

قسەکردنی دەربارەی ڕۆحی مەعنەوی دەمانبات بۆ قسەکردن لەسەر ئەوەی پێی دەوترێت یەکگرتن و، برایەتی کۆمەڵگا، مەبەست لێی پێداگرییە بۆ ئەوەی تاکەکانی ناو ئەو تاقمە خۆشەویست و، دڵسۆزی یەکتربن و، بەردەوامی بەم چەمکە بدەن. نمونەی ئەو برایەتییە پشت بە چەند هەڵوەستەیەك دەبەستێت، لەوانە:

یەکەم: پلەی پەیوەست بون و، هێزی ڕاکێشانی ئەندامانی کۆمەڵەکە:

بەهۆی خۆشەویستی و، گرنگی پێدان بە پێداویستییەکانی یەکتر ئەم هەستە باڵ دەکێشێت بەسەر تاکەکانی کۆمەڵەکەدا،

یان بەهۆی بونی خاڵی هاوبەش لە نێویاندا ئامانجی درێژخایەنی واتەکات هەموو تاکەکانی کۆمەڵەکە بەرزخوازی بکەن بۆ بەدەست هێنانی ئامانجی هاوبەشیان، تا پلەیە هاوسۆزی زیاتر بێت پارێزەری کۆمەڵە و، ڕۆحی مەعنەوی زۆرتر دەبێت بۆ یەکبون و، یەکێکی ئامانج لە کۆمەڵەکەدا.

دووەم: توانای کۆمەڵەکە لەسەر بەدەمەوە هاتنی پێداویستییەکانی کۆمەڵ:

کۆمەڵەکە زیاتر یەکێتی و، یەکبون لە نێویاندا بڵاو دەبێتەوە، ئەگەر بەردەوام بن لەسەر هاوکاری و، بەدەمەوە هاتنی داواکاریەکانی یەکتر و، بەدەست هێنانی ئامانجەکانیان.

سێیەم: هەست بەبونی هەڕەشە و، مەترسی دەرەکی لەسەر کۆمەڵ:

کاتێك تاك هەستی بە مەترسیکرد لەسەر کۆمەڵەکەی خۆشەویست و، هاوسۆزی بۆ کۆمەڵەکەی زیاتر دەبێت، وەك: جەنگ و، قەیران و، ئەزمەکان. لەم حاڵەتانەدا هەوڵ و، کۆششەکان زیاتر دەبێت.

ئەو هۆکارانەی کاریگەریان لەسەر بەرزکردنەوەی ڕۆحی مەعنەوی و، ورەبەرزی هەیە لە ناو تاکەکانی سوپادا:

(هیز و، تۆماس) پێیان وایە چەندین هۆکار هەیە کە گیانی مەعنەوی لە ناو کۆمەڵدا زیاد دەکات، ئەوانیش: پەرۆشی و، پاراستنە. ئەم دووانە دەتوانیت لە ڕێگەی چەند چالاکییەکەوە لە ناو تاکەکاندا بیڕوێنیت:

– پێداویستییە فیسۆلۆژی و، پێویستیەکان:

وەك: برسێتی و، تینوێتی و، سێکس و، خەو و، هەوا و، پلەی گەرما و، ئەو پێداویستیانەی کە زۆر گرنگن بۆ درێژە پێدانی ژیان و، مانەوە بە زیندوێتی. بونی جێگەیەك بۆ مانەوە یەکێکە لەو شتە پێویستانەی کە پێویستە فەرماندە دابینی بکات، چونکە بونی پەناگە ئارامی و، ئاسایشی بۆ تاکەکانی ئەو کۆمەڵە دروست دەکەن.

– پێداویستی ناوەندی:

ئەو پێداویستیانەن کە کۆمەڵ پێویستی تێدەکەوێت، وەك ستایش کردن و، خۆشەویستی و، باڵادەستی و، شتانی دیکە. ئەو پێداویستیانەیە کە دەبێتە هۆی جوڵەی سەرەکی بۆ مرۆڤ، کە هاوکاری فەرماندە دەکات بۆ بەدەست هێنانی ئامانجەکەی، وەك مۆڵەتدان و، ڕاوێژ پێکردن و، هاوکاری کردن لە دانانی بەرنامەی ڕێ و، گەشە پێدانی بەرنامەکانتا.

**– هاوسەنگی لە نێوان ئامانج و، داواکارییە گشتییەکان لەگەڵ پێویستییتە تاکییەکان:**

**پێویستە فەرماندە هۆشمەندبێت لە دروستکردنی یەکڕیزی ناو ژێر دەستەکانی، بەوەی هەموو ئەندامانی کۆمەڵەکە هەست بەوە بکەن، بەدی هێنانی ئامانجی گشتی، وەك بەدەست هێنانی ئامانجی تایبەتی وایە، دواجار ئەمە پارێزبەندی و، هێز لەناخی تاکەکاندا دروست دەکات بۆ بەرزبونەوەی ورە و، بەدی هێنانی ئامانجە بالآکان.**

**(شاندیسی) پێی وایە کۆمەڵێك هۆکار هەیە کە پەیوەندی بە بەرزکردنەوەی ڕۆحی مەعنەوی هەیە، ئەوانەش:**

**پەیوەست بونی دەروونی، ئازایەتی، دەست پێشخەری، کۆڵنەدان، پێداگری، دەروون ئارامی، پابەندبوون. گیانی یەك تیمی، بڕوابون بە سەرکەوتن، تێرکردین پێویستییە دەروونییەکان.**

## بۆچونەکانی لەم چەند هۆکارە کورت دەبێتەوە:

**أ– هێزی بیروباوەڕ:**

## لیوای یەکی پاراستنی سلێمانی

باوەڕ بە پایەیەکی بنەڕەتی ئازایەتی و، نەبەردیە بۆ خۆڕاگری تاکەکان لەکاتی جەنگدا دادەنرێت، هەرچەند ئیسلام وەك ئاینێکی ئاسمانی بلاّوبونەوەی دینەکەی لەسەر بنەمای جەنگ وخوێن ڕشتن نەبوە، هەمیشە بانگی هەموو مرۆڤایەتی دەکات بۆ ئاشتی و، پێکەوە ژیان و، هاوکاری و، یەك ویستی، دەفەرموێت: ﴿یاایها الناس ادخلوا فی السلم کافه ولاتتبعوا خگوات الشیگان انه لکم عدون مبین﴾ هەروەها پەیامبەر (ص) دەفەرموێت: "هەرگیز ئاواتی ڕوبەڕوی دوژمن مەکەن و، داوا بکەن خودا بتان پارێزێت، ئەگەر توشی دوژمن بوون ئەوە ئارام بگرن و، خۆڕاگربن چونکە بەهەشت لە ژێر سێبەری شمشێردایە".

ئیسلام هاتوە بۆ ڕێکخستنی ژیانی مرۆڤایەتی و، بلاّو کردنەوەی ئاشتی لەناو مرۆڤەکانداو بەرپاکردنی دادپەروەری و، خزمەتی مرۆڤایەتی. ئەگەر کەسێك بێت و، ئەو ئاشتییە تێکبدات و، ئارامی لە خەڵك بشێوێنێت، فەرماندراوە بڕواداران لەگەڵی بجەنگن و، بەسزای بگەیەنن. نابێت هێز و، چەك بۆ ستەمکاری بەکار بهێنرێت. جەنگان لە پێناو ئارامی و، ئاسایشی هاوڵاتیان ئامانجێکی گرنگە، بۆیە لەکۆتایشدا هەر ڕاستی سەردەکەوێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا يُقَاتِلُونَ فِي

## لیوای یەکی پاراستنی سلێمانی

سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ فَقَاتِلُوا أَوْلِيَاءَ الشَّيْطَانِ إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفًا﴾. **النساء: ٧٦.**

**ئەم هۆکارە بەهێزترین و، کاریگەریترین خاڵە بۆ بەهێزبونی دەروونی و، ڕوبەڕوبونەوەی هەموو قەیران و، پەستان و، هەستە نەرێنییەکان و، دروستکردنی ئاسودەیی پێویست بۆ جەنگ. ئەمڕۆ دەرنناسان توێژینەوە دەکەن لەنێوان گەشەکردنی دەروون دروستی لای تا. ئەویش بە دونیا نەویستی و، جەنگانە دژی دەروون و، ناخ و، دەستگرتن بە بەها باڵاکانەوە.**

**خۆ ویستی و، پێداگری مرۆڤ لەسەر بەرژەوەندی تایبەت و، ڕەچاو نەکردنی بەرژەوەندی کۆمەڵ و، نەتەوەکەت، ئەمە نزمترین ئاستی ڕەوشتییە، کە توێژەران (بیاجیە، کولبیرج، ورست) ئاماژەی پێدەدەن، ناشرین ترین ڕەوشتی مرۆڤایەتییە، بڕوادارانی پێشین بە کۆڵنەدان و، قوربانی دان بەگیانی خۆیان جەنگاون بۆ بڵاو کردنەوەی ئیسلام و، ئارامگرتن لەسەر ئازار و، مەینەتییەکانی، بە هێزی ئیسلام توانیویانە سەربکەون بەسەر گەورەترین دوژمنیاندا، ئەوەتا لە (٢٠٠١) جەنگی ئەمەریکا ئەفغان لەکۆتاییدا ئەمەریکا ناچار بە دانوستان کراو هێزەکانی خۆی لە ئەفغانستان کشاندەوە.**

یان ئەو پێشمەرگانەی بە دیلی دەکەوتنە دەستی تیرۆریستانی داعش، لەبەر ئەوەی بڕوایەکی بەهێزیان هەبوو کاتێك قەچۆ لەسەر ملیان بوو، ئامادە نەبوو لاوازی یان هاوارکردن یاخود لە مردن بترسن، چونکە زانیویانە مردن: تەنها ترسان لە مردن ناخۆشە، نەك خودی مردن، بینیمان شەهید (هوجام سورکی) وەك چیایەك لەبەردەم جەلادەکەی داعیش وەستابوو چونکە بڕوای بە ڕەوایەتی مەبدەئەکەی هەبوو[١].

ب- دابینکردنی پێداویستییەکان:

کاتێك مرۆڤ ڕوبەڕوی بارودۆخێکی نەخوازراوی کەمی خۆراك و، پۆشاك و، ئاو و، بێ پەناگەیی بوەیوە، توشی دڵە ڕاوکێ و، هەڵچوون دەبێتەوە. چونکە ئەم شتانە پێویستییە سەرەتاییەکانی هەموو بونەوەرێکی زیندووە. لەکاتی تێرنەبون و، بەردەست نەبونی ئەم پێداویستیانە مرۆڤ توشی بێ هیوایی دەبێت، ئەمەش دەبێتە هۆی پەرچەکرداری دانەوەی توڕەیی و، دژایەتی. ئەم دژایەتییەش کاریگەری نەرێنی بەجێدەهێڵێت. ئەم ناکۆکی و، دژایەتی کردنە کاریگەری نەرێنی دەرەکی بەدوای خۆیدا دەهێنێت کە هیچ کەس ناتوانێت ڕوبەڕوی ئەو دژایەتی کردانە ببێتەوە.

---

١ - وةرطيَرِ.

## لیوای یەکی پاراستنی سلێمانی

مرۆڤ هەمیشە بەدوای تێرکردنی پێداویستییە زیندە ژیان و، کۆمەڵایەتییەکانیەتی. ئەم تێربونەش وا دەکات بە شێوەیەکی باش تاك هەست بە ئارخەیانی و، تەواوی و، ئامادەیی بکات بۆ ڕوبەڕوبونەوەی هەموو پەستان و، ناخۆشە دەروونییەکان، ئەمەش یەکێکە لە دیاردە هەرە گەورەکانی دەروون دروستی لای سەرباز و، بەڵگەشە لەسەر بەرزبونەوەی گیانی مەعنەوی.

لەگەڵ زیادبونی پاڵنەرە بایلۆژییەکان تاکەکان زیاتر ئارەزوی کارکردنیان هەیە لە ناو سوپادا. بەڵام ئەگەر تاك نەیتوانی خواردن و، پۆشاك و، پێداویستییە جەنگیەکان دابن بکات ئەوە ئاستی دادەبەزێت و، خزمەتی کەمتر پێشکەشی دەکات ئەمەش هاوکارییەکی باشە بۆ دوژمن.

کاتێك تاك هەستی بە بێزاری کرد ئەو بێزارییە دەگوازێتەوە بۆ ناو کۆمەڵەکە، چونکە کاتێك تاك هەستی بە بێزاری کرد ئەو کات ناخەوێت، بەمەش دەبێتە هۆی بێزاری برادەرانی. دەبێت هاوڕێکانی هاوکاربن بۆ ئەوەی ئارام بێتەوە.

زۆر دەروونناسان سۆزەکانی وەك ترس و، توڕەبون و، خۆشەویست و، ئارەزو و، بە پاڵنەریی سەریکی هاوسەنگی درەوین دادەنێن. چەندین جۆر ویستە مەنی و، ئارەزو لە ناخی مرۆڤدابونی هەیە، وەك: بەها دینیەکان و، بەها ڕەوشتییەکان و،

خۆشەویستی نیشتمان و، ئارەزوی وەرزشی و، زانست و،...
هتد.

ئەم پاڵنەرە کۆمەڵایەتیانە هۆکارێکی دیکەی هاندانە، هەتا مرۆڤ زیاتر پلە و، پایەی کۆمەڵایەتی بەرزبێت ئارەزوی ئەوە دەکات زیاتر بەدەست بهێنێت و، لەوانی دیکە باڵا دەست تربێت، هەروەك ویستەمەنییەکی زۆر هەیە بۆ تێربونی لایەنەکانی دیکەی کۆمەڵایەتی یان بایلۆجی. ڕەنگە کەسێك فەرماندەیەکی سەرکەوتو بێت لە ڕاهێنان و، پرۆسە جەنگییەکاندا، لە هەمان کاتیشدا کەسێکی کۆمەڵایەتی و، ڕێزلێگیراوی نێوان هاوڕێکانیشی بێت.

بەم شێوەیە هەموو ڕەفتارێك کاریگەری هەیە لەسەر پاڵنان و، چالاککردنی مرۆڤ. پاڵنەرە مرۆییەکان هەمویی بە یەك هێز لەناخی هەمواندا بونی نییە، بەڵکو بەهۆر کاریگەری ژینگەیی و، شارستانی و، ڕۆشنبیری و، بارودۆخی تایبەتی مرۆڤ جیاوازییان هەیە.

## ئەو پاڵنەرانەی دەتوانیت لە لای سەربازەكان گەشەی پێ بدەیت:

١- پێویستی سەركێشی و، پەیداكردنی ئەزمونی نوێ: تاك بە درێژایی ژیانی ئەزمون و، زانیاری نوێ پەیدا دەكات، لەپێناو ئەوەشدا خۆی دەخاتە چەندین مەترسی و، سەركێشی جەستەیی و، عەقڵی و، كۆمەڵایەتی، ئەگەر خۆمان نەخەینە مەترسییەوە ئەوە هیچ ئەزمونێكی نوێ پەیدا ناكەین. ئەگەر بەرەو پێشچون و، هەنگاو نان نەبوایە، ئەوە نەمان دەتوانین بگەینە ئاستێكی باش لە بەدەست هێنانی چالاكی و، زانیاری. بەریتانییەكان لە جەنگی جیهانی دووەم و، فێتنامییەكان لە جەنگی فێتنام و، ئەفغانییەكان لە جەنگی دژی وڵاتە یەكگرتوەكانی ئەمەریكا، پێشمەرگە لە شۆڕشە یەك لەدوای یەكەكان و، جەنگی دژی داعش، ئەو كارەیان ئەنجام دا تا ماوەیەكی باش توانیان سەركەوتن بەسەر نەیارانیاندا بەدەست بهێنن، چونكە گیانی سەركێشیان لەناخی جەنگاوەرەكانیانیاندا چاندرابوو.

٢- دەتوانین بە ڕاهێنان ئەو پارێزبەندیانە لە ناخی تاکەکاندا بچێنین بۆ ئەنجامدانی کارەکانت و، گیانی کێبەرکێ و، سەرکەشی لە ناخی سەربازەکاندا بچێنیت، ئەمیش بەهۆی هاندانی فەرماندەکەیانەوە دەبێت، ئەم هاندانەش بۆ پڕچەکردنی تاك و، پڕکردنەوەی ئاستی مەعنەوییەتی، وەك: هۆکارێك بۆ بەرەو پێشچونی خود. بەهۆی ئەم هاندانەوە خۆی لا پەسەند دەبێت ئەمەش هۆکارێکی گەورە بۆ ئەوەی بەدڵ کاربکات.

٣- یەکێکی دیکە لە هۆکارەکانی خۆشەویستی ئەوەیە تاك هەست بە گرنگی پێدانبکات، کار بکەیت بۆ ئەوەی ئاسودەی دەروونی بەدەست بهێنێت، فەرماندە و، سەرپەرشیاران پێویستە بەردەوام لە کارکردندابێت بۆ ڕەخساندنی خزمەتی پێویست، بەتایبەت تێرکردنی پێویستییە بنچینەییەکانی. پلە بەرزکردنەوە و، پاداشت ڕۆڵێکی باش دەبینێت بۆ بەرزبونەوەی ئاستی تاکەکان.

٤- زۆر لە دەروونناسان باسی ئەوە دەکەن کە ژیانی کۆمەڵایەتی بریتییە لە: وەرگرتن و، پاداشت، واتە هەموو تاکێك مافی هەبێت و، ئەرکیشی هەبێت. ئەمەش گەورەترین نیشانەی پێشکەوتنی کۆمەڵگایە، ئامادەکردنی ئاهەنگ و، پاداشت و،

چالاکیی و، وتنەوەی وانەی پێویست، ڕۆڵکی باشی هەیە بۆ چالاککردنەوەی گیانی کارکردن لە ناخی تاکەکانی کۆمەڵەکەتدا.

دروستکردنی هەستی بەرپرسیارێتی لای تاکەکان پێویستییەکی سەرەکییە بۆ گەشە پێدانی کۆمەڵەکە، چونکە ئەگەر کەسێك کار بکات و، ئەوانی دیکە سست بن بۆ ئەنجامدانی کارەکە، ئەوە دەبێتەهۆی سستی کۆمەڵەکە و، کەس خۆی بە بەرپرس نازانێت بەرامبەر کێشەکان. تەنانەت منداڵێك ئەگەر بەشداری بکات لە کاروباری ماڵدا و، خۆی بە بەرپرسیار بزانێت بەرامبەر هەندێك کاری تایبەت بەخۆی و، سادە، زیاتر پەرۆش دەبێت بۆ خێزانەکەی و، خۆشەویستی بۆ دەردەبڕێت و، کاری بۆ دەکات. ڕۆحی مەعنەوی سەربازەکانیش وەهایە، تا زیاتر بەشداری بکەن لە کارکردن و، دەربڕینی بۆچون و، خستنە ڕوی پێشنیار و، ئەژمارکردنی زیاتر گرنگی و، دۆڵسۆزی بۆ یەکەکەی دەردەبڕێت.

ج- فەرماندەیی:

مێژو ئاماژەمان بۆ دەکات بەوەی فەرماندە ڕۆڵێکی بەرچاوی هەیە لە سەرکەوتن و، بەرپاکردنی ئارامی و، مانەوەی شکۆی یەکەکەی.

مەعنەویاتی سەربازەکان بەشێوەیەکی گشتی لەسەر بنەمایەکی مادی بونیاتنراوە، بۆیە پێویستە فەرماندە گرنگی بەپشوی سەربازەکان و، ئاسودەییان بدات. مەعنەویاتی باش لەسەر بنەمای پێداگری و، نەخشەکێشی و، تێگەیشتنی ڕون و، پابەندبون و، ڕێزگرتن و، متمانە بەچەکەکانت و، ئامادەیی بەکار هێنانی و، بەڕێوەبردنێکی پەسەند دروست دەبێت. هەموشی پەیوەندی بەو متمانەوە هەیە کە فەرماندە بەسەربازەکانی هەیە.

**وتەیەکی بەناوبانگ هەیە دەڵێت:**

**"ئەوەی بەشداری دەکات لە بونیات نانی مەعنەویاتی سەرباز و، گەشەی پێدەدات، ئەو هۆکارە مادیانەن کە پێویستە بخرێتە بەردەستی جەنگاوەران، پێویستی بە هیچ شتێك نەبێت بۆ ڕاهێنان و، بەکارهێنانی چەك، پاشان بونی فەرماندە و، بونی مافێکی ڕەوای وەها کە بتوانیت لەپێناوی قوربانی بدەیت".**

بە ئەندازەی جیاوازی یەکەو بەرپرسیارێتییەکان ئاستی فەرماندەییش بە ئەندازەی پلەکان گۆڕانی بەسەردا دێت. لە یەکە سەربازییەکاندا فەرماندە بەرپرسیارێتی زۆری لەسەر شانە، لە ئیش و، کاری بەڕێوەبردن و، ئیدارەدان و، خەمی خۆراکی سەربازەکان، بەتایبەت کاتی جەنگ و، هەروەها شوێنی مانەوە و، پۆشاك و، پشوودانی ئەندامان.

## لیوای یەكی پاراستنی سلێمانی

ئەم تێربونی دەروونییە، گرنگییەكی گەورەی هەیە لە بەرزكردنەوەی گیانی مەعنەوی. یەكێك لە بەرپرسیارێتییەكانی فەرماندە ئەوەیە كە چالاكییە سەربازییەكان بۆ سەربازەكان دەستەبەر بكات، بەتایبەت ئەو چالاكیانەی كە لەگەڵ ئاوات و، وزە و، خۆزگەكانی سەربازەكان دێتەدی و، ئارەزوی دەكەن.

فەرماندە مەشخەڵی ڕێیە بۆ پاڵنان بە سەربازەكان بۆ جەنگ، بۆ ئەوەی متمانەی تەواوی سەربازەكانی بەدەست بهێنێت، پێویستە ئاستێكی بەرزی شیاوێتی سەربازی هەبێت، لە هەمان كاتیشدا گرنگی بە ئەركە مرۆیەكانی وەك چاودێری و، شەو نخونی و، ماندوبون لەگەڵ سەربازەكانی بكێشێت. ئەگەر فەرماندە نەبێتە نمونەی باڵا بۆ سەربازەكانی بەتایبەت لەكاتی جەنگدا، ئەوە دەبێتە هۆی گاڵتە و، بەكەم سەیركردن لەلایەن سەربازەكانییەوە، هەروەها بونی ئەفسەرێك كە توڕە نەبێت و، خۆی بپارێزێت لە هەڵچوون دەبێتە هۆی بەرزبونەوەی متمانە و، دڵنیایی سەربازەكانی بەتایبەت كاتی جەنگ دوردەبن لەترس.

فەرماندەی زیرەك هیچ دەرفەتێك لە دەست نادات بۆ تێكەڵ بونی سەربازەكانی و، گوێ لە سكاڵا و، داواكاریەكانیان دەگرێت. پاشان بەهۆی تێكەڵ بونیان چەمك و، بۆچونی خۆی لایان دەردەخات و، دەیدات بە گوێیاندا. بەڵام زۆر شتی نهێنی

هەیە کە پێویستە پارێزراو بێت و، بە شاراوەیی بمێنێتەوە، هەروەها فەرماندەی سەرکەوتو بێزار نابێت کاتێك ببینێت ئاستی مەعنەویەتی سەربازەکانی دابەزییوە، ئەگەر چی ئەو نزمبونەوەی ڕۆحی مەعنەوییە بەهۆی شتی کەم بەهاو بێکەڵکیشەوە بێت.

## یاسای جەنەڕاڵ (باتۆ) لە فەرماندەییدا:

- باشترین شتی خۆت:

ڕۆژێك ئافرەتێك سەیری مێردەکەی کرد کە نوێژی دەکرد. دوای نوێژەکەی پێی وت لە پێناوی بردنەوەی یارییەکە نوێژت ئەنجامدا؟ وتی نا: نوێژم کرد بۆ ئەوەی بتوانم باشترین کار بکەم و، هەرچی لە توانام هەیە پێشکەشی بکەم.

سەرکەوتنەکانی مرۆڤ لە ناخیدا چەسپییوە، چونکە سەرکەوتن بەهۆی ئەو تۆوە سەوز دەبێت کە لەناخدا چێنراوە.

- باشترین پێشکەش بکە:

هەمیشە ئەوەت بیر بێت! هەرگیز ڕێگە نەدەیت کەسێك تۆوی لوتبەرزی لە ناو دامەزراوەکەتدا بچێنێت، خۆی لە ئەندامانی دیکەی دامەزراوەکەت بە گەورە بزانێت. بە بەردەست

و، سەربازەكانت بلێ ئێمە باشترینین، باشییەكان بۆ هەموومانە، هەموتان شایەنی ستایشكردنن.

– ترسەكەت دیاری بكە:

لە جەنگدا هیچ شتێكی ترسناكی تیانییە! ترسی جەنگ وەك ترسانە لە هاوسەرگیری. ئەگەر بترسین لەوەی ئەو ئافرەتانەی دەبنە هاوسەرت توشی كێشەت دەكەن، ئەوە بزانە بە بێ هاوسەر دەمێننەوە! بەڵام كاتێك ڕاهێنانی باش دەكەیت و، خۆت ئامادە دەكەیت بۆ جەنگ. ئەتوانیت ئیتر هەرچی ترست هەیە لەناوی بەریت و، دەست بكەیت بە ئەركەكانت.. ڕەنگە چەند فیشەكێك لەتەنیشت بكەوێتە خوارەوە، بەڵام بزانە ئەوانە جێگەی نیگەرانی نین. جەنگ وەك هاوسەرگیری وایە و، ئەو فیشەكانەی جارجار لە تەنیشتت دەكەونە خوارەوە، ئەوە وردە دەمە بۆڵەی نێوان هاوسەرانە، تا زیاتر باڵادەست بین بەسەر ئەو شەڕ بچوك و، دەمە بۆڵانەدا زیاتر پەیوەندی هاوسەرگیری بەهێز دەبێت. جەنگیش وەهایە تا لە كۆتاییدا هەموومان دەبین بە سەرباز.

لە زۆربەی كاتەكاندا ترسەكەت لە شتی نادیار و، نەبووە، باشترین ڕێگەش بۆ چارەسەری ترس زۆر ڕاهێنانە. هەتا بارودۆخ قورستر و، دژوارتربێت وات لێدەكات بەهێزتر و، بەتواناتر بیت.

## گرنگيدان بە ئاهەنگ و، بۆنە خۆشەكان:

باشترين ڕێگە بۆ چەسپاندنى ڕۆحى مەعنەوى لە ناخى سەربازەكاندا بۆنەو ئاهەنگەكانە، چونكە ڕەگ و، ڕيشەى دەڕواتە ناخى مرۆڤەوە و، باشترين ڕێگەيە بۆ پەيوەندى برايەتى لە ناوهێزە چەكدارەكاندا.

## ستايش كردنى ئاشكرا:

فەرماندەى ناوازە ئەوەيە كە باشييەكانى سەربازەكەى دەبينێت و، ئاماژەى پێدەدات و، ستايشى دەكات، چونكە ئەمە هۆكارێكى باشە بۆ باشكردنى پەيوەندى لە نێوان فەرماندە و، سەربازەكەيدا و، بەرزكردنەوەى ئاستى مەعنەوى، ئەمە هۆكارێكە هيچ كەس نييە كە پێويستى نەبێت.

## ستايش پێويستە تايبەتى بێت و، بۆ دڵسۆزى بێت:

يەكێك لە باشييەكانى ستايش ئەوەيە كە بە دڵسۆزى و، ڕاشكاوانە بێت و، ئاشكرا بكرێت و، لەكاتى خۆيدا بێت. باتۆ زۆر بڕواى بە نيشانەى ئازايەتى و، خەڵاتى ڕێزلێنان هەيە، چونكە ئەمە پاڵنەرێكى ئەرێنى و، سەركەوتوە زۆر پێويستە كە هەموو دەزگايەك هەيبێت.

## پێویستی ورد و درشیت بونی لە ستایشكردندا:

فەرماندەی باش ڕژدنییە لە بەخشینی ستایشكردندا، زۆر گرنگی بە ستایشكردن و، پیا هەڵدان دەدات، خۆزگا هەموو دەزگایەك گرنگی بە دەستكەوتی دامەزراوەكەی دەدا و، ئاشكرای دەكرد، پاشان هەواڵی ئەو دەستكەوتەی ئەندامە چالاكییەكانی بە دەزگاكە ئەوتەوە. بەڵام ژمارەی حەقیقی و، دروست كاریگەری گەورەی هەیە لەسەر دەستكەوتەكان.

## ستایش دەبێت هێندە سەیری ئایندەی بكەیت هێندە سەیری ڕابردوو نەكەیت:

هەموو دەرفەتێك بقۆزەرەوە بۆ ستایشكردنی گونجاو. چونكە بۆ سەركەوتن و، هەنگاو نان ستایشكردن بەردەوامی بەكارەكە دەدات، هەمیشە كە بیری بڕوانامەی و، نیشانەی ئازاییەتییەكان دەكاتەوە بەرەو ئایندە دەڕوانێت.

## لە كۆششی ئەوانی دیكە بێ ئاگامەبە:

جەنەڕاڵێك لە كاتی وەرگرتنی خەڵاتێكی تاكەكەسیدا وتارێكی دا، بە سەربازەكانی وت: ئێوە واتان كرد ئەم خەڵاتە ببەمەوە، من نوێنەری ئێوەم، من بۆ خۆم توانای ئەوەم نەبوو كە ئەمكارە ئەنجام بدەم، تەنها شەرەفی فەرماندەیی ئێوەم لە

ئەستۆبوو بۆیە ئیتر بومە نوێنەرتان بۆ ئەم خەڵاتە، بەڵام ئازایەتی و، بوێری وتوانای ئێوە بۆ هەمیشە دەمێنێتەوە.

لە توێژینەوەی سوپای وڵاتە یەکگروەکانی ئەمەریکا ئاماژە بەوە دراوە، فەرماندەی سەرکەوتو ئەو کەسەی کە لە سەربازەکانی نزیك دەبێتەوە. لێیان تێدەگات و، بەدواداچوون بۆ کێشە و، ئاریشەکانیان دەکات. کار دەکات بۆ ئەوەی بەیەکەوە و، وەك یەك تیم کار بکەن نەك وەك فەرماندە و، بەردەست.

پاشان ئاماژە بەوە دەدەن فەرماندەی سەرکەوتو ئەوەیە کە هەمیشە لە نزیکی سەربازەکانیەتی، بەڵام ئەو پەیوەندییە نابێت زیان بە پلە و، پایەکەی بگەیەنێت و، لاوازبێت بەرامبەریان.

د- توانای جەستەیی:

دەروونناسان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە پەیوەندییەکی زۆر بەهێز هەیە لە نێوان جەستەی مرۆڤ و، باری دەروونی، پشتگیری ئەو بۆچونە دەکەن کە پەیوەندییەکی تەواو هەیە لە نێوان جەستە و، عەقڵدا، چونکە گەشە کردنی جەستە پەیوەندی بە گەشەکردنی عەقڵەوە هەیە هەردووکیان بەیەکەوە توانای ئەوەیان هەیە مرۆڤ بەرەو تەواوێتی ببەن. منداڵێکی بچوك توانا عەقڵییەکان و، جەستەییەکانی لاوازن، زۆربەی ئەوانەی لاوازی

**عەقڵییان هەیە جەستە و، ماسولکەکانیشان لاوازە، هەروەك چۆن بەهۆی کێشە جەستییەکانیشەوە کاریگەری لەسەر عەقڵ دادەنێت و، مرۆۋ توشی نەخۆشی دەروونی دەکات. زۆر جار خەمۆکی بەهۆی نەبونی چەند خانەیەکی جەستەییەن.**

**ڕۆحی مەعنەوی سەرباز لەسەر گەرم و، گوڕی و، جوڵە و، توانای جەستەیی و، تەندروستی گشتی وەستاوە. هەروەك چۆن زۆر جوڵان وادەکات کەسەکە ئارەزوی خواردنی زۆر بێت و، گەشەی جەستەیی و، عەقڵی بۆ زیاد ببێت، فەرماندەی سەرجەم سوپاکان گرنگی بە ڕاهێنانی و، بەرزکردنەوەی ئاستی جەستەیی سەربازەکانی دەدەن، هەروەها بۆ ڕەواندنەوەی دوودڵی و، خەمۆکیش سودی زۆر گەورەی هەیە.**

**هـ – ڕاهێنان:**

**ڕاهێنان بە سەرجەم شێوە و، جۆرەکانییەوە هاوکارییەکی باش دەکات، بۆ بەرزکردنەوەی ڕۆحی مەعنەوی لە چەند ڕویەکەوە. متمانەی بەکارهێنانی چەك و، ڕاهێنان لەسەری و، بەرهەمەند بون لە جوڵەکانی جەنگ سودێکی گەورەی هەیە بۆ بەرزبونەوەی ئاستی مەعنەوی، تا زیاتر ئاسایشی ڕاهێنان بپارێزیت زیاتر زیاتر ناخۆشییەکانی جەنگ کەم دەبێتەوە. مرۆۋ زۆر لەو شتە دەترسێت نایزانێت. وەك هەموو ئەوانەی لە**

سەرەتای فێربونی شۆفێری ترسی لە شۆفێرکردن هەیە، بەڵام تا زیاتر ڕاهێنان بکات و، شۆفێری بکات زیاتر و، خێراتر فێردەبێت.

ئەگەر سەیری جەنگەکان بکەین ئەوانەی کە لەبەرەکانی جەنگ هەڵدێن ئەوانەن کە ڕاهێنانیان نەکردووە. کاتێك زیاتر ڕاهێنان دەکەیت لەسەرچەك بەتایبەتی بەکۆمەڵ زیاتر گیانی مەعنەویەتت بەرز دەبێتەوە لەکاتی جەنگدا. ئەوانەی کە لە ناو دەبابە کار دەکەن دەبینی گەرم و، گوڕن چونکە دەزانن دورهاوێژەکان بە چڕی پشتیوانیان دەکات. ئەندازیارەکان لە ناو کێڵگەی میندا هاوکاریان دەکات، یان فڕۆکەکان پشتیوانییان لێدەکات.

و- پابەندبونی سەربازی:

فێربونی یاسا و، گوێڕایەڵی فەرمانەکان یەکێکە لە هۆکارەکانی بەهێزکردنی گیانی مەعنەوی، پابەندبون (الضبط) وادەکات لە خاوەنەکەی کە بە هێزێکی پۆڵاینەوە بڕواتە ناو جەنگەوە، لەکاتێکدا بەهۆی نەبونی پابەندبن و، دیسپلینی سەربازی کارەساتی گەورە ڕودەدات و، ڕۆحی مەعنەوی بەتەواوی دادەڕوخێت. پابەندبونی سەربازی بەبەردەوام و، هەنگاو بە هەنگاو لە بارودۆخە جیاکاندا دەڕواتە ناو خزمەتی

سەربازی و، هاوکاری باشە بۆ ئەوەی فەرماندە بتوانێت بەرنامەکەی خۆی لەناخیاندا بچێنێت.

ز- هەرەوەزی:

هەرەوەزی کاریگەری زۆر گەورەی هەیە لەسەر ڕۆحی مەعنەوی و، نزیکبونەوەی سەربازەکان لەیەکتر و، هاوکاری و، بەشداری کردن لە بیرو بۆچون و، کارئاسانی کردن بۆ یەکتری.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەزمونی هاوبەش لە جەنگەکاندا کاریگەری گەورەی هەیە لەسەر ئەو کێشانەی دێنە پێشەوە، چونکە تۆ لە ناو هێزەکەتدا خەڵکی چەندین جێگەی جیا جیات کۆ کردوەتەوە، ئێستا هەمویان یەك ئامانجیان هەیە، چونکە دوژمنی هەمویان یەکێکە! تەنها یەك دوژمن ئەگەر بە کەلێن و، ناکۆکی ناو هێزەکەت بزانێت ئەوە کاریگەری گەوەرە دروستدەکات! بەلاّم ئەگەر هەرەوەزی و، هاوکاری و، برایەتی لە نێویاندا هەبێت، ئەوکات هەمویان هەست بەوە دەکەن کە دوژمنیانیەکە وئایندەیان یەکە بۆ یەك ڕێگە هەنگاو دەنێت ئەمەش دەبێتە هۆی بەهێزکردنی پەیوەندی نێوانیان و، بەرزکردنەوەی گیانی مەعنەوییان.

بونی فرە ئاراستەیی و، نەبونی هاوبەشی و، پەیوەندی لەنێوان یەكدا سەردەكێشێت بۆ دروستبونی ئاشوبی گەورە و، دروستبونی كەلێنی زۆر گەورە لەناو ڕیزەكانی هێزەكەتدا.

ح- بارودۆخی كۆمەڵایەتی و، دەروونی سەرباز:

چەندین ڕێگە هەیە، ڕەنگە كاریگەری لەسەر ڕۆحی مەعنەوی سەرباز بكات، ئەم لایەنی زیرەكی و، توانا و، چاوكراوەیی كاریگەری لەسەر دەروونی دەبێت و، توانا و، چالاكییەكانی زیاد دەكات و، توانای بەرگەر گرتنی پەستان و، بێبەش بونەكانی هەیە.

## دیاردەكانی نەبونی گیانی مەعنەویت:

- سستی و، وەستان لەكاركردن.
- دەست لە كار كێشانەوە.
- بەرزبونەوەی ڕێژەی نەڕۆشتن بۆ سەر كار و، دواكەوتن.
- سەرپێچی ئاماژە و، دیسپلینە سەربازییەكان.
- گرنگی نەدان بەكار.
- ماندو بون و، بێزاری.

- ئارام نەگرتن و، ئیش گۆڕین.

- سەرپێچی کردنی فەرمانەکان.

- نەگونجان لەگەڵ هاوڕێکان.

- بانگەشەی درۆ و، شێواندنی برادەران لەبەرچاو یەکتر.

## گرنگی ڕۆحی مەعنەوی:

ڕۆحی مەعنەوی چەندین سودی گرنگی هەیە و، کەڵکی بۆ تاك و، کۆمەڵگە و، نەتەوەش دەبێت، ئەتوانین گرنگی ڕۆحی مەعنەوی لەم چەند بابەتەدا کورت بکەینەوە:

- کاردەکات بۆ یەکێتی و، یەکبونی نەتەوە و، زیاد سەرنج ڕاکێشانی تاکەکان بۆ لای خۆی و، خۆشەویست و، دڵسۆزی تاك بۆ کۆمەڵەکەی و، پشتگیری کردنی فەلسەفە و، بەها و، بنەما و، یاسا و، کۆمەڵایەتی و، ئابوری یەکەکەی.

- وا لە تاك دەکات زیاتر دەستکەوتیان هەبێت و، ئاستی باڵاتر پێشکەش بکەن و، سەرکەوتنی باشتر لە کاتی جەنگ و، ئاشتی بە دەست بهێنن.

## <u>لیوای یەکی پاراستنی سلێمانی</u>

- کاردەکات بۆ دروستکردنی متمانەی زیاتر لە ناو کۆمەڵەکەیدا و، بە دەمەوە هاتنی زیاتری تاکەکان بۆ داواکاریەکان.

- زیاتر تاکەکان متمانەیان بەخۆیان و، ڕۆڵ و، گرنگی خۆیان هەیە و، بەهێزتری دەکەن، بەردەوام دەبن لە گرنگی دان بە بەدی هێنانی ئامانجی کۆمەڵەکەیان.

- خۆشەویست و، پێکەوە گونجان و، هاوکاری و، هەرەوەرزی لەناو تاکەکاندا بڵاودەکاتەوە، ئەمە لەکۆتایدا وایان لێدەکات کە هەمویان وەك یەك تیم کار بکەن.

- ڕیشە کێش کاری ترس و، بیم و، دڵە ڕاوکێ و، شڵەژان و، شپرزەییە، پیادەکردنی وادەکات تاکەکان زیاتر هەست بە ئارامی و، ئارخەیانی بکەن.

- بەردەوام متمانەی نوێ و، پەیمانی نوێ لەنێوان ئەندام و، فەرماندەکانی دروست دەکات و، جەختی لەسەر دەکاتەوە.

- هەستی کۆڵنەدان و، هاوکاری و، هاوسۆزی لەناو تاکەکاندا دروست دەکات بۆ کارەکەیان و، کاردەکەن لە پێناو بەرژەوەندی گشتی.

- هەر تاکێك وا لێدەکات کە هەست بە بەرپرسیارێتی خۆی بکات بەرامبەر هەموو ئەو کێشانەی دەبنە هەڕەشە بۆ سەر نەتەوەکەیان.

**ئەوانەی بەشداری دەکەن بۆ بەرزکردنەوەی گیانی مەعنەویەت و، بەدی هێنانی سەرکەوتن:**

١- ئامادەکاری باش بۆ ڕۆشتنە ناوجەنگ.

٢- دەستکەوتی باش.

٣- دڵسۆزی و، پەرۆشی بۆ کاری.

٤- جوانکاری و، بەهرەمەندی لە ڕاهێنان.

٥- چاککردنی پەیوەندی لە نێوان تاکەکانی ناو هێزەچەکدارەکاندا.

**هەندێك ئامۆژگاری و، ڕاسپاردە بۆ فەرماندەکان دەتوانێت گیانی مەعنەویەت و، ورەبەرزی لای ئەندامانی یەکەکەی دروست بکات:**

- ستایش کردنی ئەندامانی یەکەکەی، بەتایبەت کاتێك کارێکی باش ئەنجام دەدات، بەڵام ئەگەر ڕەخنە هەبوو بە

## لیوای یەکی پاراستنی سلێمانی

هەمویان بوترێت نەك بە یەك کەس، ئەگەر کاری خراپی کرد بە تەنها ڕەخنەی لێبگرە.

– لە بۆنە تایبەتەکاندا ئاماژە بدە بە ڕۆڵی یەکە سەربازییەکەت و، گرنگی و، چاکی کارەکانیان.

– متمانەی زیاتر بە یەکە سەربازییەکەت بکە و، کاربکە بۆ پابەندبون و، ڕێکخستنیان.

– کارەکانت بەسەر تەواوی ئەندامانی یەکەکە دابەش بکە و، هەمویان لە ئەرکدابن.

– هەمیشە دادگەری بنوێنە لە نێوان سەربازەکانتدا، بەتایبەت لەکاتی کارکردندا.

– هەمیشە ستایشی هەرەوەزی و، هاریکارییەکانیان بکە.

– جیاکاری و، شارچێتی مەکە، هەرگیز وانەکەیت یەکێك لە سەربازەکان لەهەمویان نازی زیاتر هەبێت.

– هەمیشە لەکاتی هەڵەکاندا ڕەخنە لە هەڵەکە بگرە، نەك لە خودی کەسەو بی شکێنیتەوە. بۆ ئەوەی سەربازەکە هەست بەهەڵەکەی بکات نەك بە کەمی خۆی

# دەروازەی پێنجەم

## دامەزراوەی سەربازی و، پرۆسەی فێرکردن

پرۆسەی فێربون تەنها لەناو دەروونناسی پەروەردەییدا گرنگی خۆی نییە، بەڵکو بۆ هەموو تاکێك و، لە هەموو جێگەیەك گرنگی خۆی هەیە. لە مێژە مرۆڤ توانیویەتی بە گواستنەوەی ئەزمونەکانی نەوە بەدوای نەوە زیاتر شتەکان ئەزمون بکات و، بۆ نەوەی دوای خۆی بیگوازێتەوە، بۆیە پەروەردە پایەیەکی گرنگی زیادکردنی بەهرە و، چالاکییەکانی مرۆڤە. سەرجەم نەریت و، زمان و، دامەرزاوە کۆمەڵایەتییەکان بەهۆی فێربونەوە گەشەیکردوە وپێشکەوتووە.

ئەگەر بڕۆینە بواری سەربازییەوە دەبینین زانست پلەی یەکەمی گرتووە.

هەروەها فێربون گرنگییەکی زۆری هەیە لەدامەزراوە سەربازییەکان، بە بنەمای یەکەم دادەنرێت لە بەڕێوەبردنی دەوڵەت وگرنگی و، پاڵپشتی گەشە پێدانی ژیری پەروەدەی سەربازی، لەمیانەی دانانی بەرنامەیەکی پێویست لەسەرئامانجی

دامەزراوە سەربازييەكان و، گيانى بەر پرسيارێتى تێربونى بنەماكانى هێز و، پياوەتى و، خۆشەويستى و، بەرگرى لە نيشتمان و، پێگەياندنى نەوەكان لەسەر بنەما گرنەگانى ژيانى مرۆڤ.

هێزە چەكدارەكان بەتايبەت لەكاتى جەنگدا بە دامەزراوەيەكى پەروەردەيى دادەنرێت بۆ فێربوون، دەبێت بكرێتە دامەزراوەيەكى فێربونى سەرباز و، ئەندامانى ئەو يەكەيە، بۆ ئەوەى ئامادە بكرێن بۆ كاتى جەنگ، دەتوانين بەرنامەى فێربونە سەربازييەكان بۆ سەر چوار گروپ دابەش بكەين:

أ- بەرنامەى ڕاهێنانى مەدەنى: سەرجەم ئەو چالاكيانە دەگرێتەوە كە ئامانج لێى گەشە پێدانەبە چالاكييە جوڵەيى، و، جەستەيى و، هونەرييەكان، بۆ ئەوەى ببێتە خاوەنى جەستەيەكى بەهێز و، تۆكمە و، تواناى بەرگەگرتنى سەرجەم كەش و، هەوا و، ژينگە و، جوگرافيايەك بگرێت.

ب- بەرنامەى مەشقى سەربازى: مەبەست لەو بەرنامانەيە كە گەشە بە توانا تەكنيكيى و، تايبەتەكانى سەرباز دەدات بەتايبەت جوڵەى و، هزرييەكان، يان ئەو چالاكيانەى گرنگى بە

جوڵە و، بەهرەمەندی بەکارهێنانی چەك و، کەرەسەتە سەربازییەکان دەدات، هەروەها گەشە پێدان بە توانا ئاەزییەکان.

ت- بەرنامەی پەروەردەی سەربازی: پەیوەستە بە بەرنامەی هۆشداری و، ئاراستەکردنی مەعنەوی و، ئامادەکردنی دەروونی و، پابەندبون و، دیسپلینی سەربازی، مەبەست ئەوەیە کە ڕۆحی مەعنەوی لە تاکدا بەرزبکەیتەوە و، بیروباوەڕ و، ئیمانی تەواوی بە دادگەری ئامانجەکەی هەبێت و، پارێزگاری لیّ بکات، هەروەها ئامانج لەم بەرنامەیە هەڵوەستەی تەواوی هەبێت بەرامبەر هەموو بارودۆخەکان، ئەمیش وەك مانۆڕی سەربازی و، خۆ ڕێکخستنەوە بۆ ئەوەی دوبارە نوێبێتەوە.

ح- بەرنامەی فێربونی ئامانجدار: ئەو بەرنامانەیە کە هێزە چەکدارەکان بەهۆی زانست و، ئەزمون و، زانیاری بە ئامانجی گەشە پێدانی لە سەر ئاستی هزری و، سەربازی و، هونەری.

## بەرنامە و، ڕەگەکانی پەروەردە و، فێرکردن:

ڕێگە و، بەرنامە و، هۆکارەکانی فێرکردن جیاوازی نییە لەو ڕێگایانەی لە جێگەیەکی دیکە بەکار دەهێنرێت، تاکە جیاوازییەك بریتییە لە: بونی ئامانج لە نێوان دامەزراوەی

سەربازى و، دامەزراوەكانى ديكە. بەگشتى پڕۆسەى فێربون لە دامەزراوە سەربازييەكاندا ڕێگەى زۆرە لەوانە:

١- دروستكردنى هاندا و، پاڵپشتى لاى تاكەكانى هێزە چەكدارەكان: واتە جوڵاندن و، هاندانى ئارەزوى فيربوون، لە ميانەى دروستكردنى هەستێك كە گرنگى بەو سودە دەدات دەگەڕێـەوە بۆ ئەو كۆمەڵگەيەى تيايدا دەژين.

٢- شيكارى و، وردەكارى: لە شيكارى چۆنێتى كاركردن و، بەڕێوە چونى ئەركە سەربازييەكان خۆى دەبينێتەوە، وەك چۆنێنێتى كاركردنى ئامێر و، كەرەستە سەربازييەكان لە ميانەى وانە و، كۆبونەوە.

٣- پيادەكردن و، شانۆگەرى: ڕاهێنەر يان ياريدەدەرى ڕاهێنەر هەڵدەستێت بە پيادەكردنى ئەركە سەربازييەكان وەك شانۆگەرى، مەبەست لەم كارەش بۆ زياتر فێربونى ئەو هونەرەيە و، لەبيرى نەچونەوەيە، زۆر جار لە ميانەى شيكارييەوە ناتوانيت ئەركە سەربازييەكە بگەيەنيت، بەڵام لە ميانەى شيكارى و، وردەكارى دەتوانيت ئاڵۆزترين بڕگە بگەيەنيت، يان ئەگەر بە هەڵە لەو جوڵەيە تێگەيشتبوون ئەوە بە ئەنجامدانى ئەو كارە لە پێش چاوى سەربازەكانى جوانتر پێيان دەگات.

**٤- پیادەکردنی سەربازەکان بۆ ئەو وانەیەی خوێندویانە، بۆ ئەوەی زیاتر لە ناخیاندا بچەسپێت.**

**بابەتی خوێندنی بەرنامەی سەربازی و، پیادەکردنی لەسەر سەربازەکان ئاسان نییە، ناشبێت هەر لەخۆتەوە کاری لەسەر بکەیت و، بە ئاسانی وەریبگریت، لەبەر ئەم خاڵانە پێویستە بەگرنگی سەیری بکەیت:**

**أ- سروشتی هێزە چەکدارەکان و، ئەو ئامانجانەی لە پێناوی دامەزراوە.**

**ب- سروشتی ئەرکە سەربازییەکان و، ئامێر و، کەرەستە بەکارهاتووەکان تیایدا.**

**ت- سروشتی تاك و، کۆمەڵەکان، لە بواری پسپۆڕی دەروونی و، کۆمەڵایتی و، جەستەیی و، عەقڵی.**

**س- سروشتی زانست و، زانیاری و، گۆڕانکارییە تەکنیکی و، تەکنەلۆژییەکان.**

**لێرەوە، دەبینین بەرنامەی ڕاهێنان و، ئامادەکارییە سەربازییەکان بە جومگەیەکی بەرفراوانی زانست و، زانیاری بڵاو بوەتەوە و، چەندین لقی جیاوازی مرۆیی لیٚ جیا بوەتەوە.**

دەروونناسی ڕۆڵێکی بەرچاو دەبینێت، لە پیادەکردنی ئەم بەرنامەیە ئەگەر سەیری تایبەت مەندییە مرۆییەکانی وەك: پاڵنەر و، ئارەزو و، ئاراستە و، توانا عەقڵییەکان بکەین، دەبینین درەوننناسی لە هەموویاندا کاردەکات، ئەگەر دەروونناسی لە ناو ڕاهێنانە سەربازییەکاندا دەر بهێنین ئەوە ناتوانێت ئامانجی سەرەکی خۆی بپێکێت، چونکە ئەو زانست و، زانیاری و، ئەزمونە دەروونییەی کە بەدەستی دەهێنیت، پێگەیەکی گەورە دەبینێت لە پێگەیاندنی سەرباز. لەبەر ئەوەی کە ئەم بەرنامەیە جێگەی گرنگی پێدانە بۆیە هەمیشە تاك ئەتوانێت لە میانەی ئەمەوە ئاستی خستنە ڕوو و، جەنگی بەرزتربێت، چونکە ئەم جۆرە بەرنامانە دەبێتە هۆی چاککردن و، گەشە پێدانی ڕەوشت و، زانیاری پێشکەوتوو.

## چەمکی فێربون:

چەمکی فێربون پەیوەندیبە پرۆسەی بەدەست هێنانی ڕەوشت و، ئەزمون و، گۆڕانکارییە بە ئاراستەکانی ژیانی مرۆڤ هەیە، چونکە دەر ئەنجامەکانی پرۆسەی فێربوون دەری دەخات کە سەرجەم شێوە و، ڕەفتارەکانی مرۆڤ لە بیرکردنەوە و، جوڵە و، پەیوەندی کۆمەڵایەتی و، زمانەوانی، بەهۆی کەڵەکەبوونی زانیستەوە لە مرۆڤەوە لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دیکە گوازراوەتەوە و، بەجێماوە.

پرۆسەی فێربونی مرۆڤ لەسەر چەند شێوە و، بنچینەی سادە و، هەندێکی ئاڵۆز بونیات نراوە، کە تیایدا ڕەفتارە عەقڵی و، کۆمەڵایەتی و، زمانەوانی و، جوڵەییەکانی تیا دەردەکەوێت. فێربون چەمێکی گریمانەییە ئاماژە بەوە دەکات کە پرۆسەیەکی زیندوی مرۆڤە و، لە میانەیەوە توانای گۆڕینی ڕەفتاری هەیە و، مرۆڤ ئەتوانێت بەهۆیەوە دەست بەسەر ژینگەدا بکرێت و، وەك ئەوەی دەیەوێت بەکاری بهێنێت.

واژەی فێربون لە دەروونناسیدا بەمانایەکی فراوانتر بەکار دەهێنرێت لە زاراوە ڕۆژانەکانی ژیاندا، تەنها مەبەست لە

پرۆسەى خوێندنى قوتابخانە نييە، بەڵكو سەرجەم ئەو زانستانە دەگرێتەوە كە تاك فێرى دەبێت لە زانست و، زانيار و، بير و، ئەندێشە و، هاوسۆزى و، نەريت و، بەها و، ستراتيژييەكانى ديكە، ئيدى ئەم فێربونە بەهۆى خوێندنەوە بێت يان بەهۆى نەخشە بۆ دانان، يان بەهۆى وتارەوەبێت.

بابەتى فێربون لەم كاتەدا جەمسەرێكى سەرەكييە كە تيۆريا دەروونى و، كۆمەڵايەت و، پەروەردەيية جۆراوجۆرەكانى لەسەر بونياتنراوە، بۆ ئەوەى مرۆڤ بتوانێت لەڕێگەيەوە تێبگات و، ئاراستەكان بزانێت.

## پێناسەى فێربوون:

فێربون واتە گۆڕانى ڕەفتار و، ڕەنگدانەوەى لەو كەسەدا، چونكە زيندەوەران لە بچوكترين ئاستى، تا گەورەترينيان كە مرۆڤە تواناى فێربونى هەيە. پرۆسەى فێربون لاى مرۆڤ پێويستى بە توانا و، بەهرەمەندى جۆراو جۆرەوە هەيە و، سەرجەم بوارەكانى مرۆڤ لە ڕوى جەستەيى و، دەروونى و، زانيارى و، بەهرەمەندييەكانى دەگرێتەوە.

فێربون پرۆسەيەكى بەردەوامە، بەدرێژايى ژيانى مرۆڤيش بەردەوام دەبێت، بەردەوام لە چالاكبون و، گەشەكردن و،

نوێبونەوە و، بەرزبونەوەدایە. چەندین هۆکار هەیە کە کاریگەری لەسەر فێربون دادەنێت، لەوانە: کاریگەری مادی، مەعنەوی، پێکهاتە و، ژینگەیی. دەروونناسان لە چەند ڕویەکەوە سودیان لێ بینیوە و، گرنگیان پێداوە و، چەندین پسپۆڕیان تێدا دەرهێناوە، چەندین پێناسە بۆکراوە. (لیندا دافیدوف) دەڵێت: "پڕۆسەیەکی بەردەوامە و، گۆڕانکاری لەئەزمونەکاندا دەکات". (ماك کونل) دەڵێت: "گۆڕانکاری بەردەوامی ڕەوشتییە پەیوەندی هەڵوەستەیە مرۆڤەوە هەیە، بە هەوڵە تاکییەکان و، گونجان لەگەڵ گۆڕانکارییەکاندا سەرکەوتو دەبێت". (گیتس) دەڵێت: "پڕۆسەیەکە بۆ بەدەست هێنانی هاوکارییەکان و، بەدی هێنانی ئامانجەکان، بە ئاسانی توانای چارەسەری کێشەکانی هەیە". سادەترین پێناسەی بریتییە لەو: "ڕەوشتەی بە ئاسانی دەتوانێت ئەزمون و، شارەزایت پێ پەیدابکەیت".

## تایبەتمەندییەکانی پڕۆسەی فێربون:

یەکەم: فێربون پڕۆسەیەکە بەردەوام لە گۆڕانکاریدایە:

سێ جۆری وەرگتن هەیە:

١- پەیداکردنی ئەزمون و، ڕەفتاری نوێ.

٢- واز هێنانە لە ئەزمون و، ڕەفتارێکی دیکە.

٣- ڕاستکردنەوەی ڕەفتار، یان ئەزمونێك.

دووەم: پەروەردە پڕۆسەیەکی کارلێکەرە:

بە هەردوو شێوە مادی و، مەعنەوییەکەی کارلەسەر کارلێکردنی لەسەر تاك دەکات. چونکە زانست پڕۆسەیەکی مرۆییە لەگەڵ ژینگە و، کەرەستەکانی ژیانسازی. ئەم کارلێکردنەش هەموو بوارەکانی هەست و، جوڵەیی و، کردەیی دەگرێتەوە، ئەم گەیاندنەش بەهۆی بەکارهێنانی زمان و، گوتارەوە دەبێت، یان بەهۆی نوسینەوەی تێبینی و، تێڕامان و، بیرکردنەوە و، بەڵگەکاری.

سێیەم: خوێندن، پڕۆسەیەکی بەردەوامە:

پەیوەست نییە بە کات و، شوێنی دیاریکراوەوە. پڕۆسەیەکە لە درێژایی ژیانی مرۆڤ بەردەوام دەبێت. پەیوەست نییە بە شوێنی دیاریکراوەوە، دەربارەی شوێن و، ماڵ و، قوتابخانە و، پەرستگا و، زانکۆ و، سەربازگە دەدوێت.

چوارەم: فێربون پڕۆسەیەکی کەڵەکە بوی پلەبەندییە:

**بریتییە لە کۆبونەوەی کۆمەڵێك نەریت، بەهرە، زانیاری، ئاراستەکردن و، بەگەڕ خستن و، کۆکردنەوەی زانست لە پێناو زیاتر پەیداکردن و، دەستکەوتی زیاتر لە ئایندەدا.**

**پێنجەم: فێربون پڕۆسەیەکە سەرجەم ڕەوشت و، ئەزمونە سەرنجڕاکێش و، ناخۆشەکان دەگرێتەوە. زۆر جار بەهۆی زانستەوە ڕەوشتی دوژمن کارانە و، تاوان کاری و، بەدکاری پەیدادەکەیت، یان بەهۆی زانستەوە بەها باڵاکانی وەك خۆشەویستی و، هاوکاری و، یارمەتیدانی بەرامبەر پەیدا دەکەیت.**

**شەشەم: زۆر جار زانست پڕۆسەیەکە بۆ ئەوەی باشتر و، دروستتر ئاراستەت بکات بۆ ئامانجەکەت.**

**حەوتەم: زانست پڕۆسەیەکە سەرجەم گۆڕانکارییە جێگیرەکان دەگرێتەوە.**

**بە هۆی کاریگەری ئەزمون و، پیادەکردن و، ڕاهێنان، ئەو ڕەفتارانەی بەهۆی کاریگەریی شتێکەوە دەگۆڕێت وەك ماندبون و، نەخۆشی و، پێگەیشتن و، خەوتن، دەتوانیت بەهۆی زانستەوە ڕێکی بکەیتەوە، یان ئەو کاریگەریانەی بەهۆی فیسۆلۆژییەوە**

دروست دەبن زۆر جار ئەتوانیت بەپێی زانست کارەکانت ئەنجام بدەیت.

**هەشتەم: فێربون پرۆسەیەکەی فرەڕەهەندی دیارە:**

تەنها کار لەسەر لایەنی ڕەوشتی و، ئەزمونێکی دیاری کراو ناکات، بەڵکو کار لەسەر سەرجەم ڕەوشتە گۆڕاوەکانی وەك: عەقڵ و، هەڵچون و، لایەنی کۆمەلأیتی و، جوڵەیی و، زمانەوانی و، ئەخلاقیش دەکات. بەهۆی ئەو جولأنەی فێری دەبێت تاك نەریت و، چالاکی جوڵەیی بەسود و، گەشە پێدانی هزری پەیدا دەکات، هەروەها خو نەریت و، بەها و، یاسای ڕەوشتی گشتی پەیدادەکات، لە هەمان کاتدا واژە و، وتەی نوێی زمانەوانی و، شێوەزارەکانی دیکە پەیدا دەکات، زیاتر گاداری ئەو کەرەستانە دەبێت کە بەکاری دەهێنێت.

**نۆیەم: فێربون پرۆسەیەکی خۆبەخشییە:**

واتە مرۆڤ بەهۆی فێربونی زانیاریی و، چالاکی و، ئاراستەکردن و، کەڵەکەبونی ئەزمونە جیاوازەکانی ژیان پەیدادەکات.

**دەیەم: فێربون پرۆسەیەك پەیوەندی بە وروژاندن و، بەدەمەو هاتنەوە هەیە:**

جەوهەری فێربون و، مانای سەرەکی زانست ئەو پەیوەندییەیە کە کاریگەری لەسەر مرۆڤ دەکات و، وەڵامی داواکارییە ناخییەکانی مرۆڤە.

یانزەیەم: فێروبن دوبارە داڕشتنەوە و، بونیات نانی ئەزمونەکانی ڕابردووە:

فێربون بریتییە لە بەکارهێنانی ئەزمونەکانی ڕابردوو لەبەردەم هەڵوەستەیەکی نوێدا و، دووبارە داڕشتنەوە و، پشتبەستکردنی ئەو ئەزمونە.

## پێوەرەکانی فێربوون:

پێوەری فێربون بەهۆی کاریگەریە دەرەکییەکان دیاری دەکرێت، بەڵام پێوەرەکانی خێرایی و، وردی فێربون بریتییە لە:

أ- خێرایی.

ب- وردی: خۆی لە هەستان بەکارێك یان ئەرکێك کە کەمترین هەڵە بکەیت.

ت- بەهرەمەندی: خۆی لەتوانای خۆ گونجاندن دەبینێتەوە، لەسەر ئەو ڕۆڵە جیاوازانەی دەیدرێتە تاك، لە پێشکەشکردنی کار بەوردی و، جوانکاری و، خێرایی.

س– ژمارەی ئەو هەوڵە پێویستانەی کە هەڵتگرتووە بۆ ئەو کارە.

## بنەماكانى فێربوون:

ئەتوانین وەهاباسی بنەماکانی فێربون بکەین کە بریتییە لە: کۆمەڵێك تەکنیك و، هونەر کە بەهۆیەوە ئەتوانین ڕەفتارەکانی تاك بۆئەو ئارساتەیە ببەین، پێویستمانە بەزوترین، کات کاریگەری پەیدا بکات، لەگەڵ ئەو ژینگەیە کە دێتە بەردەمی، لە هەر بارودۆخێکدابێت، بەگشتی ئەتوانین بنەماکانی فێربون بۆ دوو بەش پۆلێن بکەین: ئەو بنەمایانەی کە تیۆریا ڕەفتارییەکانی لێ دەر هاتووە و، ئەم بنەمایە کار لەسەر ئەو ئەزمونانە دەکاتکە بەهۆی ژینگەوە فێری بووە. دووەم: ئەو بنەمایانەی کەبەهۆی تیۆرای زانستییەوە و، بەهۆی پڕۆسەی خوێندن و، بیرکردنەوە فێری بووە.

## بنەماكانى فێربونى ڕەوشتى:

زانایانی ڕەوشتناسی پێیان وایە هەموو جوڵەیەك وەڵامدانەوەی هەیە، پێکهاتەی عەقڵی مرۆۋ بریتیە لە خەرمانێك لە ئەزمون بەهۆی سروشتی عەقڵەوە دەستی کەوتووە،

**پێکهاتەکانی عەقڵیش بەهۆی بنەماکانەوە فێری شتەکان بووە و، هیچ پەیوەندی بە بۆ ماوەییەوە نییە.**

**ئەم کارانە بەهۆی جوڵە و، وەڵامدانەوەوە کۆیکردوەتەوە، گەشەی عەقڵی بەهۆی ئەو کۆکەرەوانەوە پەیدای کردووە کە لە منداڵییەوە تا ئەو کاتە کەڵەکەبووە و، کۆیکردوە، بەهۆی تێپەڕبونی کات ئەو شتانەی کە فێری بووە تێبینی گۆڕانکاری کردوە لە خۆیدا، بەهۆی ئەم گۆڕانکاریانەوە ئەو منداڵە هەستی بە گەشەی عەقڵی خۆی کردوە، تاك بەندەی جوڵەکانییەتی هەرچی توشی دەبێت بەهۆی جوڵەکانیەوەیە، بۆیە پێویستە تاك بۆ ئەوەی زانستێکی تەواو گونجاو فێربێت پێویستە بە ئەرێنی و، دروستی وەڵامی هەموو جوڵە و، داواکاریە پێویستەکانی خۆی بداتەوە.**

**تەنها ئەوە فێربونی کەکاری پێدەکەین:**

**یەکێك لەگرنگترین بنەماکانی خوێندنی ڕەفتاری لە ماوەی کارکردندا، وەڵام دانەوەی ئەو داواکاریانەی کە فێری دەبیت، بۆیە پێویستە هەمیشە دەرفەت بدەیت بە خوێندکارەکانت بۆ ئەوی کار لەسەر ئەوکارانە بکەن فێری بوون، ئەوکاتە دیاردەی فێربوون بەهۆی کارکردن دەردەکەوێت ئەمەش یەکێکە لە مەنهەجە بەربڵاوەکان، تاك بەهۆی فێربونەوە مامەڵە لەگەڵ**

ئەوشتانە دەکات کە پێی هەڵدەستێت، ئیدی بە هۆی نوسینەوە بێت، یان بەهۆی جوڵە و، ڕاستکردنەوەی هەڵە و، ئامۆژگارییەکانی خاوەن ئەزمنەکان.

## پیادەکردن:

پیادکرن و، دووبارەکردنەوە و، ڕاهێنان و، مەشق کارێکی زۆرگرنگە، چونکە جوانی و، باشی فێربونی تیا دەردەکەوێت، دووبارەکردنەوە زیاتر هێزت پێدەبەخشێت، کارەکە هەرچەند گران بێت بە دووبارەکردنەوە و، مەشقکردن لەسەر ئاسان دەبێت و، بەرگریش دەکات لە لەبیرچونەوە و، لەیادکردن، پێویستە هێندە مەشق بکەن کە کارەکە هەرچەند گران و، دژواربێت زۆر ئاسان و، سادە بێتەوە، پێویستە دوبارەکردنەوە لە ژێر سەرپەرشتیاری خاوەن ئەزمونێکدابێت، بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی دروست ئەنجامی بدات، بەڵام ئەگەر ڕاهێنان بە هەڵە و، سەربەخۆیی ئەنجامی بدەیت توشی هەڵەیەك دەبیت کە ئەستەمە ڕاست بکرێتەوە.

## پاداشت و، سزا:

مەبەست لە پاداشت هەرچییەك بێت کە ببێتە هۆی خۆشی و، ئاسودەیی و، فێرخواز هانبدات بۆ ئەنجامدانی کاری چاکتر،

واته وەك وەرگرتنى ديارى، زۆرجار دياريييەكە وشەيەكە، يان دياريييەكى مادى ياخود پشوودانيەتى لەكارێك يان چەپڵەليێدانێك، نابێت هەرگيز دوو دڵبين لە بەخشينى ديارى، بۆ ئەوەى كاريگەرى ئەرێنى لە ناخى فێرخوازدا دروست بكەين.

## پاڵنەرەكان:

دياردەيەكى ناخييە لاى هەموو تاكێك بونى هەيە و، كاريگەرى لەسەر ڕەفتارەكانى دەكات و، بەردەوام دەبێت لەسەر ئەو كارە، كۆمەڵێك بارودۆخى ناخيى و، دەرەكييە لە پێناو هاوسەنگى مرۆڤ، كاردەكات بۆ ئەوەى بگەنە ئامانجێكى ديارى كراو، ئەو ئامانجەش دەبێتە بەدەمەوە هاتنى پێويستى و، ويستەمەنييە ناخييەكان، تێربونى ويستەمەنييەكان وەڵام دانەوەى باشە بۆ بەدەمەوە هاتنى داواكارييكان و، بەهێزكردنى تواناى فێرخواز، زۆرجار بەهۆى بەدەمەوە هاتنى داواكارييەكان لە كۆمەڵێك دياردە و، ئازار دوردەكەويتەوە.

## پەرچەكردارى كلاسيكى:

پەرچەكردارى كلاسيكى يەكێكە لە زاراوە گرنگەكانى دەروونناسى، ئەو پڕۆسەى خوێندنەى لە ڕێگەى جوڵاندن و، بەدەمەوە هاتنەوە پەيدا دەبێت. بە دەستەواژەيەكى ديكە پێى

دەوترێت (وڵامدنەوە) و، پەرچەکرداری مرۆیی یان زیندەوەران، بەهۆی ئەوەی کە بە دەم کارێك یان داواکارییەك پەیدا دەبێت.
ئەم زاراوەیە لەسەر دەستی (ئیڤان بافلوف)ی ڕوسی پەیدابووە:

١- پەرچەکدرار، وەڵام دانەوەی بەدەست نەهاتوە، لە ساتی لە دایك بونی هەر بونەوەرێك دروست دەبێت، بەتایبەت دوای دەست کردن بە جوڵە.

٢- هەڵچونی بێ مەرج، واتە بەبێ مەرجی بونی پەرچەکردار دروست دەبێت.

٤- جوڵەی مەرجدار - جوڵەی یەکلاکەرەوە، دوار دەرکەوتنی جوڵەی مەرجدار ئیدی وەڵام دانەوەی مەرجدار دەست پێدەکات.

٥- وەڵامدانەوەی پەیوەست بوون، پەیوەستی بە ئەزمونی زیندەورانەوە هەیە لەگەڵ دەورو بەری.

## تیۆریای فێربون بە هەوڵ و، ڕاستکردنەوە:

پێی دەوترێت تیۆریای (سوراندایك) زۆر ناوی دیکەی هەیە: هەوڵدان و، هەڵە، گەیشتن، بژارکردن و، پەیوەندی، لەڕێگەی گرنگی دان بە ئەنجامدانی کارەکان لە ڕوانگەی زانستی ڕەوشتە

سايكۆلۆجى و، فێربونى ئەو كارانەى كە كاريگەرى لەسەر دەروونى فێر خوازكردوە وەربگرين بۆ چارەسەرى كێشەكان.

## شكارى ( سوراندايك ) بۆ فێربون:

سوراندايك پێى وايە فێربونى گيانلەبەران لاى مرۆڤ بەهۆى هەوڵدان و، هەڵەكردنەوە دەبێت. كاتێك وادەكەيت فێرخواز ڕوبەڕوى كێشەيەك ببێتەوە، بۆ گەيشتن بە ئامانجێكى ديارى كراو، ئەو هەوڵە يەك لەدواى يەكانە وەڵامدانەوەيەكى باشى داواكاريەكانيەتى و، لە قۆناغێك ڕزگارى دەكات بۆ قۆناغێكى ديكە، بەهۆى پاداشتكردن زياتر وەڵامێكى دروستى هەوڵە سەركەوتنەكان دەدەيتەوە. (سۆران دايك) ژمارەيەك پێوەرى داناوە بۆ فێربون لە هەڵەكان، دەپرسێت: بۆچى لەكاتى فێربونى دروست هەوڵە هەڵەكان كەم دەبێتەوە بەتايبەت لەكاتى كێشەكاندا؟

(سۆراندايك) زانايەكى ئەمەريكييە، يەكەم كەس بووە كە ياساى ئەزمون كردنى تاقيكردنەوەكانى لەسەر گيان لەبەران بەرفراوانتركرد– دەڵێت: "تيۆرياى فێربون بريتييە لە گۆڕانكارييەكى ڕەفتارى كە بەهۆى خوێندن و، بەبەرداگرتن زياتر تبێبينى گرنيگەكەى دەكەيت لەسەر ژيانت".

سەرەتا ڕەفتار بەهۆی جوڵە لە ڕوكەش و، هەستەوەرەكانى زيندەوەران دەردەكەوێت دواتر ئەو جوڵەيە دەگوازرێتەوە بۆ دەورو بەر، بە وەڵامدانەوەی ئەو ئاگاداركردنەوە كارەكە تەواو دەبێت. بنەمای ئەم ياسايە بريتييە لەوەی گۆڕانى ڕەفتار بە جوڵە دەست پێدەكات و، بە وەڵامدانەوە كۆتايى دێت.

## ياساكانى فێربون بە هەوڵدان و، هەڵەكردن:

(سوران دايك) تەنها بەپێناسەی بابەتەكەی نەوەستاوە، بەڵكو هەوڵيداوە شيكارييەكى باش بكات لەنێوان جوڵە و، وەڵامدانەوە، بەهۆی چەند ياسايەكەوە زياتر لە ناخى بەرامبەر بى چەسپێنێت.

(سوران دايك) چەند ياسايەكى داناوە بۆ گەياندنى تۆرياى هەوڵدان و، هەڵەكردن، چەندين جار ياساكانى داڕشتوەتەوە و، گۆڕانى تيا كردووە لە پێناو وەڵام دانەوەی ئەم پرسيارە:

بۆچى هەميشە هەوڵە هەڵەكان كەم دەبێتەوە نامێنن و، هەوڵە دروستەكان دەمێننەوە؟

لە ياساكانى (سوران دايك):

يەكەم: ياساى دووبارە كردنەوە:

باسی ئەو هەوڵ و، شكستانەی تاكە دەكات لە میانەی فێربون دەستی دەكەوێت، بەڵام شیكاریان بۆ ناكات. بۆمان ڕون ناكاتەوە چۆن بتوانیت جوڵە ڕاستەكە بسەلمێنین و، هەڵەكە لەناو بەرین. (سوران دایك) پێی وایە كە یەكەم كار برتییە لە دووبارەكردنەوە، ئەمەش بەهۆی پەهێزبونی پەیوەندی جوڵە و، وەڵامدانەوەی، بەهۆی دووبارەكردنەوەی كارەكە ئاسانكاری و، دروست كاركردن دەدۆزیتەوە.

(سوران دایك) پێی وایە ئەم یاسایە دوو بەشە:

١- یاسای بەكار هێنان: ئاماژە دەكات بۆ ئەوەی كە پەیوەندییەكە بەهۆی دووبارە كردنەوە وپیادەكردن بەهێزتر دەبێت.

٢- یاسای پشتگوێ خستن: بەهۆی دووبارەكردنەوە و، مەشق كردنەوە هەڵەكانت بیر دەچێتەوە.

دووەم: یاسای كاریگەری:

ئەم یاسایە لەسەر ئەوەی كە تاك ئارەزوی دووبارەكردنەوەی شتە دروستەكانی هەیە و، یان ئەو كارانەی كە پاداشتیان لەسەرە، هەروەها زۆرجار بۆ واز هێنان لە ڕەوشتێكی هەڵە كە دەبێتە هاودەمی زیتر توشی ئازار دەبێت و، پێی ناخۆش دەبێت.

وەڵام دانەوەی ناخی سەرکەوتن ئەوەیە کە هەست بە دڵشادی و، خۆشنود بون و، ئاسودەیی بکات، بۆیە پەیوەندییەکی زۆر بەهێز هەیە لە نێوان جوڵە و، بەدەمەوە هاتنی سەرکەوتو، کە لە دەر ئەنجامەکەی چێژ و، خۆشییەکی زۆر بە خاوەنەکەی دەبینێت، تەنانەت منداڵێك کاتێك برسی بێت و، چەندین جار دەست بۆ قتوە شیرەکەی ببات، بەڵام بەهۆی گەرمی قتووەکەوە دەستی بگەڕێنێتەوە ڕادێت لەسەر ئەوەی واز لەو خۆشیەی ژیانی بهێنێت لەترسی گەرمی قتووەکە.

سێیەم: یاسای ڕاهێنان:

ئەم یاسایە ئاماژە دەکات بۆ کاریگەر بوون بە بەکارهێنان و، زیاد بەهێزکردنی پەیوەندی یان لاوازی پەیوەندی. مەبەست لە بەهێزکردن لێرەدا: واتە ئەگەر وەڵامدانەوەی زیاتر هەبێت. مەبەست لە لاوازیش پێشهاتنی ڕوداوێکە کە بەهۆی دەرکەوتنی پەیوەندییەکە ڕودەدات.

چوارەم: یاسای ئامادەکردن:

(سوران دایك) ئەم یاسایەی بەکارهێناوە کە بریتییە لەیەکەی پەیوەندی بەستن، بەهۆی وێناکردن یان دیاری کردنی

**کارێك فێرخواز هەست بە ئاسودەیی یان بێزاری دەکات.**
**دەتوانین یاسای ئامادەکاری بۆ چەند پسپۆڕی دابەش بکەین:**

**١- ئەگەر یەکەی پەیوەندی ئامادەی پەیوەندی بەستنبێت، واتە بۆ ئەنجامدانی ڕەوشتێك، بەمەرجێت ئەم کارە ئاسودە ودڵخۆشکەریش بێت.**

**٢- ئەگەر یەکەی پەیوەندی ئامادەی پەیوەندی کردن نە بێت، ئەگەر ئەوکارەی کە دێتەپێش بێزارکەر و، وەرسکەربێت.**

**٣- ئەگەر یەکەی پەیوەنەدی ئامادەی کارکردن بێت، بەڵام ئەو کارە دەبویە هۆی بێزاری بونەوەرێکی زیندووی دیکە.**

**پێنجەم: یاسای ئارەزوکردن:**

**(سوران دایك) ئەم یاسای بە پێی بونی پەیوەندی بەهێز لەنێوان جوڵە و، وەڵامدانەوەی دروست دیاری کردوە، واتە ئەگەر ئارەزوی دروستت بۆ کارەکە هەبێت زیاتر وەڵام دانەوەت بۆی دەبێت، ئەمەش وادەکات تاك زیاتر پابەندی یاساکان بێت، واتە نەك تەنها بە وشە ئامادەی پیادەکردنی یاساکان بێت، بەڵکو بە ئاماژەی سەری بۆ خۆشنودی ئامادەی ئەوە بێت کە ئەو کارەی زۆر لا پەسەندە، تا ئارەزومەندی بۆ کارەکان زیاتربێت توانای**

پیادەکردنی کارەکە زیاتر دەبێت، بۆ نمونە تینو وەڵام دانەوەی بۆ ئاو زیاتر وەك بۆ پارە.

**شەشەم: یاسای وەڵام دانەوەی فرەیی:**

**ئامارژەیە بۆ ئەو یاسایەی کە فێرخواز چەند وەڵامدانەوەیەکی جۆراوجۆری دەبێت بۆ خۆشنودی و، ئاسودەیی لەو کارە، هەرکات فێرخواز توشی ڕوداوێك دەبێت چەند وەڵامێکی ئەرێنی ودروستی دەبێت بۆ چارەسەرکردنی.**

**حەوتەم: یاسای ئاراستەکردن و، بەنامە ڕێژی:**

**ئەم یاسایە ئامارژەی بۆ کاریگەر بونی زانستی بەسەر چەند ئاراستەیەك لەسەر فێرخواز، ئەوکاتە وەڵامدانەوەش فرە چەشن و، فرە ڕەهەند دەبێت و، بە ئەندازەی ژینگە و، ڕۆشنبیریەکەی دیاری دەکرێت. ئاراستەکان تەنها نیشانەی ئەوەنییە کە فێرخواز دەیکات، بەڵکو دیاریکردنی ئەوەیە کە ستایشی دەکات و، یان پێی بێزارە، بۆ نمونە کەمانچە ژەنێکی ناودار بێزارە لەوەی کەسێك ئامێری کەمان بە نەزانی و، نە شارەزییا بژەنێت، ئەم یاسایە کار لەسەر تاك دەکات کە بەهۆی وەڵام دانەوەی بۆ هەموو ئاراستە دەرەکییەکان پەیداکردنی پسپۆڕییە و، سود وەرگرتنە لەو ئەزمونانەی دێنە بەردەستی.**

# دەروازەی شەشەم

## پابەندبون و، پەیوەست بوو ( الضبط والربط )

## پێشەکی

ئەم بابەتە گرنگییەکی دیاری هەیە لە بواری چالاکییە سەربازییەکاندا، سروشتی ئەم چالاکییە لەکاتی جەنگدا بێت، یان لەکاتی ئاشتیدا کاری وردو باش دەکات لەسەر ڕێکخستنی یەکە، زۆر نمونەی دیارمان هەیە کە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات پابەندبون و، پەیوەست بوون لە گرنگی ڕاهێنان و، خۆ سازدانی کەم نەکردوەتەوە بۆ ئەوەی سەرکەوتن بە دەست بێت.

بۆ نمونە سوپای ئیتاڵی لە جەنگی جیهانی دووەمدا لە ئەفەریقا توشی چەندین شکستی یەك لەدوای یەك بویەوە، لەسەر دەستی هێزە لاوازەکانی بەریتانیا کە لە ڕوی ژمارە و، لە ڕوی پێشکەوتنی چەکەوە زۆر لە ئیتاڵییەکان لاوازتربوون، بەڵام بە هۆی پابەندبون و، پەیوەست بونەوە لە ئیتاڵییەکان بەهێزتربون و، دیسپلینی سەربازیان بەهێزتربوو. بۆ نمونە ئەڵمانییەکان زۆر لە ئەمەریکی و، بەریتانییەکان لاوازتربوون،

بەڵام بەهۆی پابەندبون و، ڕێکخراوەییانەوە توانیان لەچەندین جەنگدا سەرکەون بەسەر سوپای ئەو دوو وڵاتە زلهێزەدا، ئەویش بەهۆی چەند هۆکارێکەوە بو کە گرنگترینیان پابەندبونی سەربازە ئەڵمانیەکان بە فرمانەکانەوە و، متمانەی تەواویانبە رومیلی فەرماندەیان.

## گرنگی پابەندبون و، ڕێکخستنی لە کۆمەڵگەی سەربازیدا :

سروشتی جەنگی مۆدێرن ئەو چەکە پێشکەوتوانە دەیکەن کە هەیە، بەڵام هەر پێویستی بە هاوکاری بەکۆمەڵ و، دەستی گەورەی مرۆڤ هەیە، هەروەها ئەم ژمارە زۆرەی سەرباز ئەگەر بە پابەندبون و، ڕێکخستن نەبێت ناتوانیت بە ڕێوەی بەریت و، ئیدارەیەکی باشیان بکەیت.

زۆر جار پابەندبون و، ڕێکخستنی ژمارەیەکی کەم توانای بەرگری زیاترە لە یەك سوپای بێ یاسا و دیسپلین. دووەمیان مەترسی شکستی زۆرترە. تەمبەڵی و، سستی لە پیادەکردنی ئەرکەکاندا دەبێتە هۆی کەوتنەوەی زەرە و، زیانێکی زۆر گەورە، کە ڕەنگە تەنها لە سەر چەند کەس زیانی نەبێت، بەڵکو زیانی بۆ سوپایەکی بەهێزیش دەبێتە مەینەتی و چەرمەسەری، ڕەنگە دوژمن زۆر بە ئاسانی سەربکەوێت بەسەرتدا.

## ليواى يەكى پاراستنى سلێمانى

ناپليۆن پێى وايە: "كە لە هەموو جەنگێكدا ئەگەرى ئەوە هەيە كە ئازاترين سەرباز هەڵبێت، هۆكارى ئەم هەستەش لەوەوە سەرچاوەى گرتووە متمانەى بە ئازايەتى خۆى نييە، لە هەمانكاتدا ڕەنگە بەرامبەر زۆر سادەبن و، ئەوە نەبن كە ئەمان لێى دەترسن. بەڵام كاتێك پێشتر پابەندى و، ڕێكخستنى باش لە نێوانياندا هەبێت ئەوە سەركەوت مسۆگەر دەكەن و، ترسەكەيان دەڕەوێتەوە".

لەڕاستيدا تەنها بە سزادان ناتوانيت جەنگ ببەيتەوە ئەگەر ڕاهێنان و، مەشقى باشت بۆى نەكردبێت، بۆيە پابەندبون و، ڕێكخستنيش وەك هەر خويەكى مرۆيى پێويستە ڕاهێنانى لەسەر كرابێت، كاتێك لادان لە ناو سوپادا دروست دەبێت تاكەكان ئارەزوى ئەوە دەكەن كە چاو لەو شتە بكەن كە فێريبوون، تاك بە گەيشتنە ناو كۆمەڵەكەى ئارەزوى ئەوە دەكات كە پەيوەنديان پێوە بكات و، چاويان لێبكات، هەميشە كۆمەڵ پێويستى بە ڕێكخستنى و، پابەندبون بە ياساكانەوە هەيە.

بەڵام زيادە ڕۆيى كردن لەسزادان بە سەرجەم جۆرەكانيەوە وادەكات ئاستى بەردەستەكانت دابەزێت، لە هەمانكاتيشدا چاوپۆشيكردنى بەردەوام لەگەڵ بەردەستەكانيشدا دەبێتە هۆى ئەوەى توشى لادان بن، زۆرجار بەهۆى بالآدەستى ئەفسەرێكى

لاو تەواوى سزا و، ديسپلينە سەربازييەكان بەسەر بەردەستەكانيدا وادەكات هەمويان بێزارى دەربڕن. باشترين ڕێگە بۆ پيادەكردنى سزادانى بەردەستەكانت بريتييە لەوەى كە مام ناوەند بيت لە سزادانىدا و، هەرگيز ڕقت لە سزادراو نەبێت.

پێويستە سزادان جۆرێك لە پابەندبون و، نێوەندگيرى تيا بێت، بۆ ئەوەى نەبێتە هۆى ياخيبون و، ستەمكردن، چونكە ستەمكارى گيانى دژايەتى و، تۆڵەكردنەوە لەناو هێزەكاندا دروست دەكات.

هەروەها زيادەڕۆيى لەچاوپۆشيكردن و، پشتگوێ خستن. لادانى زياتر و، سستى لە ناو هێزەكەتدا دروست دەكات، چونكە كاتێك مرۆڤ هەستيكرد كە دەسەڵاتێك نييە ڕاستى بكاتەوە و، ياساى بۆ دابنێت تاوانەكانى لا بچوك دەبێت و، توشى لادانى گەورەى سەربازى دەبێت و، دەست درێژى دەكاتە سەر مافى كەسانى ديكە.

بۆ گەشە پێدان و، ڕێكخستنى ڕەوشتى سەربازى پێويست بە هۆشدارى تايبەتە بۆ ئەوەى بە يەكسانى و، هاوسەنگى هەنگاو بنێيت. تەواوى سوپاكانى جيهان كە تازە خەڵكيان بۆ دادەمەزرێت زۆر پێداگرى دەكەن لەسەر ئەوەى كە هۆشدارى دروست و، بەرچاو ڕونى بدەن بەتاكەكان بۆ ئەوەى بە خێراترين

کات فێری بنەما سەربازی و، پابەندبونی سەربازی بېن و، بنەما گرنگە سەربازییەکانی فێردەکەن. ئامانجێکی دیکە ئەم هۆشدارییە بریتییە لە پێدانی بیرۆکەی سەرەتای و، سادە و، دەروازەی گوێڕایەڵی و، هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی.

گرنگترین بنەمای ژیانی سەربازی لە ئیسلامیشدا بریتیە لە: گوێڕایەڵی و، ڕێکخستنی نەرتی سەربازی، چونکە بنەمای دین بریتییە لە گوێڕایەڵی، بۆیە پابەندبونی تەواو لە نیشانەکانی بەرزی ئیمان و، بیروباوەڕە، تەنانەت یەکێك لە مەرجەکانی سەربازی لە ئیسلامدا پێگەیشتنە، بۆ ئەوەی تەواو ئامادەیی پیادەکردنی یاسا سەربازییەکانی هەبێت.

## چەمکی پابەندبون و، ڕێکخستنی سەربازی:

کۆمەڵگەی سەربازی بریتییە لە ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی، بەتایبەت ڕێکخستنی تەواو لە سروشتی پەیوەندییەکان بۆ بەدی هێنانی ئامانجەکان، کە لە پێناویدا هەنگاو دەنێین، لەم ڕوانگەیەوە تایبەت مەندی ئەم کۆمەڵگەیە پێویستە لەسەر تاکەکانی کە ڕێزی بنەماکانی بگرن و، پابەندی پێوەر و، دامەزراوە و، فێرکارییەکانی بن، کە لەسەر بنەمای بیرو باوەڕ و، بەها بالاکان و، ئامانجی کۆمەڵکە بونیات نراوە و، لەو پێناوەشدا کاردەکات.

## لیوای یەکی پاراستنی سلێمانی

پابەندبونی سەربازی لەکاتی جەنگدا زیاتر پێویست دەبێت، هەرچەند لە کاتی ئاشتیدا پێویستە کاری بۆ بکەیت، بەڵام لەکاتی جەنگ و، ناخۆشیدا پێویستی زۆر زۆر بە پابەندبون هەیە و، دەبێت بە دڵکاری ودڵسۆزی و، بەرگەرکردتن و، گوێڕایەلچ بون بۆ فەرمانەکانی دامەزراوەکە کاری بۆ بکەیت بۆ ئەوەی سەرکەوتن و، بردنەوە بەدەست بهێنیت. زۆربەی سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە زۆر سوپای گەورە و، بەهێز و، خاوەن چەکی پێشکەوتوو، بەهۆی پابەند نەبونیان توشی شکستی زۆر گەورە بوون، لە سەر دەستی سوپایەکی خاوەن سەرباز و، چەکی لاواز و، کەم و، بونی پابەندبونێکی تەواو بە فەرماندەکەیانەوە.

ئەتوانم ئەوە بڵێم پابەندبون و، ڕێکخستنی سەربازی بەردی بناغە و، پایەی سەرەکی سەرکەوتنە لە ناو هێزەچەکدارەکاندا، ئەوسوپایەی ڕێز و، برایەتی و، دڵسۆزی و، پابەندبونی زیاتر تیایە باشتر و، بەهێزتر دەردەکەون لەو سوپایەی کە تەنها بەشێوە لە سوپا دەچن، لە جەنگی دژ بە عێراق بۆمان دەرکەوت هۆکاری سەرەکی داڕوخانی سوپای عێراق نەبونی پابەندبون و، ڕێکخستنی سەربازی باشبوو، چونکە هێزە عێراقییەکان بەهۆی گەمارۆی ئابورییەوە توشی لێکترازانی گەورە ببونەوە، هیچ سەربازێکی عێراق بڕوای بە ئامانجی باڵای نیشتمان و، فەرماندەکەی نەمابوو.

چاندنی پابەندبون لە ناو یەکە سەربازییەکاندا کارێکی ئاسان نییە، چونکە پابەندبوون خۆی لە خۆیدا پڕۆسەیەکی کۆمەڵایەتی ئاڵۆزە، خۆی لە گوێڕایەڵی ڕاستەوخۆ دەبینێتەوە لە لایەن تاکەکانی هێزە چەکدارەکان لە ژێر سایەی بارودۆخە جۆراو جۆرەکاندا.

## پێناسەی پابەندبون وڕێکخستنی سەربازی:

پابەندبون لە تێڕوانینی دەروونناسی سەربازییەوە برتییە لە: "دیاردەیەکی عەقڵییە بەهۆی ئەو ڕاهێنانەی کە بە سەرباز ئەکرێت لە ناخی ئەوکەسەدا دەچەسپێت". بۆیە دەتوانین بە ڕاهێنان پابەندبونی سەربازی لە ناخ و، عەقڵی تاکەکاندا بچێنین و، بە هۆی جێبەجێکردنییەوە گەشەی پێ بدەین و، ڕەفتارێکی دروست لە ناخی سەربازەکاندا بچێنین.

پابەندبونی دروست تەنها گوێڕایەڵی نییە، چونکە گوێڕایەڵی بەشێکی بچوکی پابەندبوونە، بەڵکو پابەندبوون ئەوەیە کە ئەگەر چاودێریش نەبێت تۆ هەر پابەندی فەرمانەکان بیت، واتە پیادەکردنی کارەکان بە باشترین و، تەواوترین شێوە، نەك بەهۆکارێکی دەرەکی، بەڵکو بەهۆی پاڵنەرێکی خودییەوە، تەنها بەهۆی بیروباوەڕ لەدایك دەبێت. ئەگەر سەیری پیادەکردنی فەرمانەکان بکەین دەبینین بەهۆی ئامادەکاریی پێشوەخت و،

شوێن کەوتنی ڕەوشتی گونجاوەوەوە دروست دەبێت، و، بەردەوامی پێدەدرێت، ئەمەش مەرجێکی سەرەکییە بۆ بەدەست هێنانی دەستکەوتی گەورە.

## دارِشتنەوەی کۆمەڵایەتی بۆ پابەندبون و، ڕێکخستن:

له دارِشتنەوەی کۆمەڵایەتی پابەندبون تاك دەبێتە تاکێك لەو کۆمەڵگەیە. واتە پرۆسەیەکی فێرکاری کۆمەڵایەتییە تاك تیایدا ڕەوشتە کۆمەڵایەتییەکان فێر دەبێت و، تیایدا دەردەچێت. ئەمیش پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتی فرە چەشنە سەرەتا لە خێزانەوە دەست پێدەکات و، ئامادە دەبێت بۆ کۆمەڵگە ئەویش کەگەشتە کۆمەڵگە وەك کەسێکی پێگەیشتوو کارەکانی ئەنجام دەدات.

ئەو ژینگەی کە ئەوتاکەی تیا گەورە بووە کاریگەری تەواوی هەیە لەسەر ڕەفتارەکانی و، ئەو کارانەی ئەنجامی دەدات. بەڵام هەرچۆن بێت تاك بەهۆی ئەوەی لە ناوکۆمەڵگە توشی چەندین ئاستەنگ و، کلتوری جیاواز و، مامەڵەی کۆمەڵایەتی دەبێتەوە لەیەکتری جیاوازن، تەنانەت ڕەوشتە بۆماوەییەکانیش کاری تێناکات، چونکە دوو منداڵی دوانە نابینیت هەموو ڕەوشتەکانیان وەك یەك بێت، کاریگەری بۆ ماوەییشان وەك یەك نییە. چونکە تەنانەت ژینگەی ناوسکی دایکیشیان جیاوازە،

بەڵام لە ڕووی ئەزمونی خودییەوە، دوو کەس تەنانەت ئەگەر لەناو یەك خێزانیشدا بن، یەك پەروەردەیان هەبێت ڕەوشتەکانیان لەیەك جیاوازە و، هەر یەکەیان خاوەنی سروشتی تایبەت بەخۆیەتیز

پیاوێك لە گوند گەورە بووە سروشتی جیاوازە لەگەڵ یەکێك لە شار لە دایك بووە، کۆمەڵگەیەك جیاوازە لە کۆمەڵگەیەکی دیکە، هیچ دوو شێوەیەك نییە لە نێوان دوو کەسدا لەڕوی ڕەوشتییەوە، کۆمەڵگەی سەربازیش بە هەمان شێوەیە، سروشتێکی تایبەت بەخۆی هەیە، کار لەسەر سورشتی تایبەت و، تاکە کەسی دەکات، فێرکارییەکانیشان جۆرێك لە جیاوازی ڕەوشتی سەربازیان تیایە، هەروەها هۆکارەکانی ڕاهێنان و، فێربونیش جیاوازی بەخۆی هەیە لەسەریان، بەڵام گرنگترین بنەماکانی سەربازی بریتییە لە پابەندبون و، ڕێکخستن.

کۆمەڵگەی سەربازی هەموو ماوەیەکی کۆمەڵێکی گەورەی تاکەکانی لە سەرجەم ژینگە و، کۆمەڵگە جیاجیاکانەوە ڕوی تێدەکەن، هەرچەند سروشت و، ژینگەکەشیان لەیەك جیاوازە و، بواری زۆر لە نێوانیان هەیە، بەڵام لە کۆمەڵگەی سەربازیدا ئەو جیاوازیانە نامێنێت هەموو جیاوازییەکان لە ژێر یەك چەتردا کۆ دەکەنەوە، بەهۆی کاریگەر بونی کۆمەڵگەی سەربازی داڕشتنی

سەربازی بۆ ئەنجامدانی کردن بە یەك شێوە یان یەك کەس کاردەکات، لەوانەیە ئەمانە هەڵوەستەیان جیاوازبێت بەرامبەر گەشە کردنە سەربازییەکان، بەڵام کاریگەری کۆمەڵگەکەیانی هەر لەسەرە.

بۆ نمونە: ژمارەیەکی زۆر تاکی جیاواز لەبەردەستماندا هەیە، لەئاستی عەقڵی و، ئامادەیی و، کەسێتی و، دەروونیان لەیەك جیاوازن، هەوڵ دەدەین هەمویان بگەیەنینە یەك ئاستی دیاری کراو لە گەشەکردنی کەسی و، توانا و، ئاستی سەربازییان، ئایا وەڵام دانەوەی هەمویان وەك یەك وایە؟ نەخێر، جیاوازییەکی زۆر لە نێوانیاندا هەیە، هەندێکیان زۆر بە ئاسانی فەرمانەکان وەردەگرن و، گوێڕایەڵی دەبن، بەڵام هەندێکی دیکەیان سروشتیان وەهایە کە وەری ناگرن. ئەمە پێویستی بەکاتە بۆ ئەوەی هەمویان بگەیەنیتە پلەیەك کە نزیك خاڵ بێت بۆ فێربونیان.

## ڕۆڵى پاداشت و، سزا لە داڕشتنەوەى كۆمەڵگە :

پاداشت و، سزا دوو بنەماى گرنگى داڕشتنەوەى بنەماى كۆمەڵايەتيدا، چونكە ئەو دوانە دوو هۆكارى باشى پەروەردەى تاكن لە كۆمەڵگەدا، ئەو تاكەى كە بەهۆى هەوڵدان و، هەڵەكردنەوە فێردەبێت پێويستە هەستى پێبكات، واتە هەڵەكردن لە كارێكدا و، ڕاستكردنەوەى بە ئەنجامدانى ڕەوشتێكى دروستتر. سزادان ئەگەر چى بە شێوەى هۆشدارى و، ئاگاداركردنەوەش بێت ئەوە كەسەكە هەست بە تاوان دەكات و، هەوڵى ڕاستكردنەوەى دەدات، هەروەك چۆن پاداشت وادەكات كە خاوەنەكەى زياتر ئەو ڕەوشتەى لە ناخدا بچەسپێت و، پێى كاريگەربێت.

لە كۆمەڵگەيەكى سەربازيدا بۆ ئەوەى ياساكان بەرپابێت و، پابەندبون و، ڕێكخستنى لەناو يەكەكانى سوپادا بچەسپێنيت پێويستە سزا بكەيتە بنەماى كارەكانت، هەروەك چۆن پاداشت لە وێنەى ستايشكردن (ميداليا و، خەڵاتكردن) ڕۆڵێكى بەرچاوى هەيە بۆ هاندان بەرەو باشتر، بەهەمان شێوە سزاش ڕۆڵێكى بەرچاوى هەيە لەوەى ترس لە دڵى سەربازەكاندا بچێنيت، بۆ ئەوەى هەڵە ئەنجام نەدەن. سەرباز لە كاتى جەنگدا توشى مەترسى و، ناڕەحەتى دەبێت، ئەمەش واى لێدەكات زياتر بەهێز

و، پۆلاین بێت، زیاتر ئامادەبێت بۆ ئەوەی ڕووبەڕوی ترسەکانی ببێتەوە و، نەشتوانێت گاڵتە بە یاساکان بکات.

خاڵکی گرنگ هەیە کە پێویستە هەمیشە لە پێش چاوت بێت، ئەویش ئەوەیە کە سزادان بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەی کەسەکە بێت، بەڵام ئایا چی ئامانجێکی دیکەی هەیە؟ ئامانجی سەرەکی بریتییە لە ڕێککردنەوە و، هێنانە ناو کۆمەڵگەیە، چونکە ئەگەر کارەکە تەنها لەبەر ترسبێت ئەوە هیچ ئامانجێکی گەورەت نەپێکاوە، لەبەر ئەوەی کاری سەرەکی بریتییە لە ڕاستکردنەوەی هەڵەکانی و، ئامادەکاری دەروونی لا پەیدا ببێت کە کاری باشە ئەنجام بدات، هەمیشە یاساکان بەو ئاراستەدا دەڕۆن کە بنەما کۆمەڵایەتییەکان داوای دەکەن. کاتێك ئەفسەر یان ئەفسەری پۆل سەر لە سەربازەکەی دەدات لە خاڵی پاسەوانیدا بەخەبەرە و، کە ئەوان دەڕۆن ئیدی سارد دەبێتەوە، یان دەخەوێت و، کەمتەرخەمی دەکات، ئێمە دەبێت ئەو ترسە لە ناو بەرین، نابێت یاساکان بۆ ئەوەی بێت بترسن، دەبێت بۆ ئەوە بێت کە ئەوە لە ناخیدا دروست بکەین ئەو کارە بۆ چاودێری کردنە و، گرنگە بەری ڕێگەی ڕاستە، ئیدی چاودێر هەبێت یان نا.

بەپێی دیاری کردنی سزاکە دەبێت سەیری ئەو شوێنەوارە بکەین کە بەجێی هێشتووە، بۆئەوەی جۆری سزاکە و، بارودۆخ و، کاتی سزاکە دیاری بکەین، ئەمەش دوو وێنەی هەیە:

وێنەیە یەکەم: ئەو ڕەفتارە هەڵەیە کە ئەنجامی داوە نەك سەیرکردنی کەسەکە.

وێنەی دووەم: سەیکردن و، بەهەند وەرگرتنی کردارە هەڵەکە و، ئەو کەسەی پێی هەستاوە، لە زۆربەی کاتەکاندا ئەبێت لێکۆڵینەوە لە کەسەکەش بکەین، چونکە هەندێك کەس گیانی شەڕانگێزی تیایە.

لە حاڵەتی یەکەم سزاکە بۆ ڕەفتارە هەڵەکەی بە لەبەرچاو گرتنی ڕاستکردنەوەی ئەو هەڵە، بەڵام لە حاڵەیتی دووەمدا سزاکە بەشێکە لەکارەکانی ئەو کەسەی کە پێی هەستاوە.

بۆ نمونە: هەواڵت پێدەدەن کە تاوانێك ئەنجام دراوە لە جێگەیەك لە نێوان دوو سەربازتدا، کە دەگەیتە شوێنی ڕوداوەکە دوو سەرباز شەڕیان کردووە، ئەمە یەکێك لەم دوو ڕێگەی بۆ بەکار دەهێنیت و، سزای پێویستیان بۆ بەکار دەهێنیت، بەڵام بۆ پیادەکردنی وێنەی دووەم دەبینی یەکێکیان ئەوی دیکەی بریندارکردووە و، یان سوکایەتی پێکردووە، یان ناو ناتۆرە و،

هەڕەشەی لێکردووە، ئەمەیان دەبێت زیاتر بەدواداچوون بکەیت و، کار بکەیت بۆ سزادانی و، ڕاستکردنەوەی کارەکەی. لە حاڵەتی شەڕەکە تەنها هەوڵ دەدەیت ڕەفتارەکە چاك بکەیتەوە و، بیگۆڕین، بەڵام لە حاڵەتی بریندارکردن یان سوکایەتی پێکردن پێویستە تۆڵەی لێ بکەیتەوە و، هەڵەکەی بۆ ڕاست بکەیتەوە.

## ڕۆڵی فەرماندە لە پڕۆسەیە پابەندبون و، ڕێکخستندا :

گومانی تێدا نییە فەرماندە بەرپرسێکی سەرەکییە لە چاندنی پابەندبونی سەربازی لای هێزە چەکدارەکان، فەرماندە سەربازییەکان ئەتوانن بە ئاسانی پابەندبون و، ڕێکخستنی سەربازی بەم خاڵانەی لای خوارەوە لای سەرباز و، بەردەستەکانیان بچێنن.

یەکەم: دەبێت فەرماندە سەربازییەکان نمونەیەکی باڵابن لە ڕێز و، شکۆمەندی بۆ ئەوەی سەربازەکانیان پابەندی یاسا و، نەریت و، بنەمای دامەزراوە سەربازییەکەبن، تۆ ناتوانیت سزای بەردەستەکانت بدەیت لە کاتێکدا فەرماندە سەربازییەکان بەردەوام خەریکی شکاندنی بنەما و، یاسا سەربازییەکانبن، بۆ نمونە: فەرماندەیەك چۆن دەتوانێت لێپرسینەوە لەگەڵ

سەربازێكی بكات بۆ نەپۆشینی پۆشاكی سەربازی، لەكاتێكدا خۆی پۆشاكی ئاسایی پۆشیووە، لە هەموو كاتێكدا فەرماندە نمونەی بالایە بۆ ئەوەی سەربازەكانی شوێنی بكەون.

دووەم: پێویستە فەرماندە سەربازییەكان دادپەروەربن لەمامەڵەكردن لەگەڵ سەرجەم تاكەكانی هێزە چەكدارەكاندا، نابێت فەرماندە لەگەڵ هەندێك ئاسانكاری بكات و، لەگەڵ هەندێكی دیكە توندوتیژبێت، یان بەهۆی بەرژەوەندی تایبەتی خۆی چاوپۆشی لە هەندێكیان بكات.

سێیەم: بەكارهێنانی پاداشت و، خەڵات بۆ پێزانین بە توانای سەربازەكان، چونكە بەكارهێنانی دیاری و، پاداشت چەمكی پابەندبون و، ڕێكخستن لای تاكەكانی هێزە چەكدارەكان بەهێزتردەكات گیانی كۆڵنەدان و، كۆششكردنیان تیا دەچێنێت، هەروەها گیانی مەعنەوی و، ئارەزوی جوانكاری لە كاردا و، پابەندبون بە یاسا دانراوەكانیانیان لا خۆشەویست دەبێت و، زیاتر ئارەزوی دەكەن.

زۆر خەڵات و، پاداشت هەیە كە فەرماندە دەتوانێت بەكاری بهێنێت، پاداشتی زارەكی، پاداشتی دارایی، پاداشتی ئاماژەی، نیشانەی پێزانین و، چەندین پاداشتی دیكە، زۆر پێویستە كە ئاگامان لە دادپەروەری بێت لە كاتی دابەشكردنی پاداشتەكاندا،

یان ئاگامان لەو سەربازانە بێت دەیانەوێت فریومان بدەن، بەتایبەت بەدرۆ و، فێڵ و، گرتنە بەری هۆکاری نادروست بیەوێت پاداشت وەربگرێت.

چوارەم: بەکارهێنانی سزا جۆراو جۆرەکان بۆ بەرپابونی پابەندبون و، ڕێکخستنی سەربازی، واتە بە ئامانجی ڕاستکردنەوەی ڕەفتارە نا پێویست و، نادروستەکانی سەرباز ئەو کارانە ئەنجام بدات، چونکە ڕاستکردنەوەی هەڵەشە هەر پاداشتە، واتە کاتێك سزایەکت سەپاند ئەو هەڵەیە شیاوی ئەو سزابێت، ئیدی هەر تاکێکی ئەو سەربازگەیە ئەنجامی دابێت،.

هەمیشە دەبێت ئاگادارکردنەوە و، ڕاستکردنەوەی هەڵەکان بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو هەڵەبێت نەك بۆ سزادانی کەسیی.

بنەماکانی (شۆفیلد) بۆ چاندنی پابەندبونی سەربازی لای هێزە چەکدارەکان:

*- یەکێك لە بەرپرسیارێتی فەرماندە، بریتییە لە: چاندنی بنەماکانی پابەندبون و، ڕێکخستنی لای تاکەکانی هێزە چەکدارەکان.

*- پەیوەندی نێوان فەرماندە و، بەردەستەکانی لەسەر بنەمای گۆڕینەوەی ڕێز و، بەها باڵاکان و، خۆشەویست و،

دڵسۆزی بێت، ئەم پەیوەندییە بە یەکێك لە بنەماکانی چاندنی پابەندبونی سەربازی دادەنرێت.

*- سازکردنی دەرفەتێك بۆ هەڵگرتنی بەرپرسیارێت و، کارکردن لەسەری بە پێی توانای کەسەکان، ئەمەشە گەشە بە پابەندبون دەدات لای کەسەکان.

*- گرنگیدان بە هاندان و، پاداشت و، خەڵات بۆ زیاتر چەسپاندنی پابەندبوون.

*- بەکارهینانی سزا لەکاتی پێویستدا، بەتایبەت لە کاتی یاخیبون و، سەرپێچیکردن.

*- کارکردن لەسەر پابەندبوون کە لە ناخی کەسەکە سەرچاوەی گرتبێت- نەك لەبەر ئەوەی کە فەرمانە یان واجبە لەسەرت.

## نیشانەکانی پابەندبونی سەربازی:

پابەندبونی سەربازی چەندین دیمەنی دیاری هەیە هەیە، لەوانە:

یەکەم: باڵادەستبوون بەسەر خودی مرۆڤ:

سەربازی پێویستی بە کۆشش زۆرتر و، کاری دڵسۆزترە بۆ ئەوەی چالاکییە سەربازییەکانی وەك ڕاهێنان و، جێبەجێکردنی ئەرکەکان و، پاكو خاوێنی چەك و، کەرەستە و، خزمەتگوزارییەکانی دیکە ئەنجام بدات، ئەمەش لە کۆتایدا بەرپرسیارێتییکی جەستەییە بۆ ئەوەی ناخی مرۆڤ ئاسودە بکات و، پابەندبون و، کۆنترۆڵی زیاتری بکات.

دووەم: ڕێکخستنی ڕەوشتییە تایبەتی و، کۆمەڵایەتییەکان:

کۆمەڵگەی سەربازی بەوە جیا دەکرێتەوە کە کەشێکی تایبەتی بەخۆی هەیە، بەو پاخشانەش لە کۆمەڵگەکانی دیکە جیا دەکرێتەوە، بۆیە ژینگەی سەربازی لەبەرچاو دەگیرێت بۆ ئەوەی پەیوەندییەکانی ناو دامەزراوە سەربازییەکان و، پەیوەندییە دەرەکییەکان یەك بگرن و، بە یەك شێوە مامەڵە بکەن.

یەکێك لەو شتانەی کە لە سەربازەکان داواکراوە کە ڕێز لە پلەکانی سەروخۆیان بگرن و، هاوسۆزیان بۆ پلەکانی هاوشانیان و، پلەکانی خواروخۆیان هەبێت، هەروەها پێویستە خۆیان بەدوربگرن لە سەرجەم مامەڵە نادروست و، نەشاوەکان لەگەڵ سەروی خۆیاندا.

**سێیەم: ڕەنگدانەوەی گونجاندنی دەروونی لە پابەندبون لای هێزە چەکدارەکاندا:**

**فەلسەفەی دامەزراوە سەربازییەکان پشت بەو ڕوداو و، فێرکاریانە دەبەستێت کە وەك پێویست دەگۆڕێت لای تاکەکانی هێزە چەکدارەکاندا، کاتێك کەسێك دەڕواتە ناو دامەزراوەیەکی سەربازی خۆیان لەبەردەم داواکاری نوێدا دەبیننەوە، کە ئەو داواکاریانە لە ژیانی مەدەنیدا بونی نەبوو، ئەم داواکاریانەش پێویستی ئەوە لەسەر تاکەکان دادەنێن کە پابەندی تەواوی پێوەر و، بنەما و، یاساکانی ئەو دامەزراوەیە بن، ئەوکاتە پرۆسەی گونجاندنی درونی و، لەگەڵ لایەنە کۆمەڵایەتییەکە دروست دەکەن.**

**چوارەم: پابەندبون و، خۆ ڕێکخستنی سەربازی پەیوەستە بە گیانی مەعنەوییەوە لای تاکەکانی هێزەچەکدارەکان:**

**پیادەکردنی پێوەر و، یاسا سەربازییەکان دەبێتە هۆی کاراکردنی دەسەڵاتی سەربازی، ئەمەش بەرز بونەوەی ڕۆحی مەعنەوی لای تاکەکان زیاتر دەکات، بەتایبەت ئەگەر جۆرێك لە داد پەروەری و، یەکسانی لە پیادەکردنی یاساکاندا هەبێت.**

## لیوای یەکی پاراستنی سلێمانی

# پابەندبونی سەربازی گرنگی خۆی هەیە لە جەنگدا :

بابەتی پشتگیری پابەندبونی سەربازی و، ڕاهێنانی تاکەکانی سوپا بەگیانێکی لەخۆ بوردییەوە بەشێوەیەکی هەمیشەیی، کار دەکات بۆ ئەوەی فەرماندەکان و، سەرباز و، دامەزراوە سیاییەکان بەتەواوی ئامادەی جەنگ بن.

ڕۆشنگەری و، بیر فراوانی لە پابەندبونی سەربازیدا بنەمای سەرەکی بەکارهێنانی چەکە لە جەنگدا و، هەمیشە سەرکەوتن مسۆگەر دەکات.

بچوکترین کەم تەرخەمی و، یاسا شکێنی لە کاتی جەنگدا کارەساتی گەورە دروست دەکات، زۆر جار بەهۆی هەڵەیەکی دیسپلینی کارەسات و، چارە ڕەشییەکی زۆری بەسەر سوپادا هێناوە، چونکە ئەرکی هیچ کەس کەم بەها نییە لە ناو سوپادا، بۆ نمونە سەربازێك لەکاتی پاسەوانیدا کەم تەرخەمە لەو کاتەدا بەهۆی بێ ئاگایی ئەمەوە دەستەکەی دەکەوێتە مەترسییەوە، بە کەوتنی دەستەکەی پۆلەکەی بە تەواوی تیا دەچێت، بە تیاچونی پۆلێك سەر دەکێشێت بۆ سریەیەك و، دواتر بۆ فەوج و، وێران بونی وڵاتێك.

## لیوای یەکی پاراستنی سلێمانی

هەتا زیاتر بنماکانی پابەندبون دووبارە بکەیتەوە بەسەر سەربازەکانتدا، زیاتر جەخت لەسەر پاراستیان دەکەیتەوە، زۆر جار دەبێت لە بچوکترین یەکەوە دەست پیٚ بکەیت، چونکە سەرکەوتنی هەموو سوپاکان بەشێکی سەرەکی پەیوەندی بە یەکە بچوکەکانە، زۆر گرنگە لە هەموو یەکە بچوکەکاندا یاسا گشتییەکان پیادە بکەیت و، ڕێگە بە سەر پێچی و، لادان و، سستی نەکەیت لە پیادکردنی فەرمانەکاندا.

# دەروازەی حەوتەم

## گونجاوی و، شیاوێتی دەروون دروستی لە کۆمەڵگەی سەربازیدا

### سایکۆلۆژیای سازان لە کۆمەڵگەی سەربازیدا :

– تایبەت مەندییەکانی کۆمەڵگەی سەربازی:

کۆمەڵگەی سەربازی لە کۆمەڵێك یەکەی جیاواز لە یەك لە ڕوی پۆلێنکردن و، ئەرك و، پیشەکانیان پێك دێت.

یەکەی سەربازی بریتییە لە کۆمەڵگەی سەربازی بە کۆمەڵێك پەسن کە جیاوازە لە کۆمەڵگەی مەدەنیی و مەدەنی: جیاوازە لە خێزان و، کۆلان و، هۆز، چونکە کۆمەڵگەی سەربازی زۆربەیان پیاوانن، تاکەکانی بە هەموو جیاوازیی و، دوور لە بژاردەی خۆیان کۆ دەبنەوە و، پێکەوە کار دەکەن.

ئەم کۆمەڵگەیە بە کۆمەڵێك تایبەت مەندی و، پسپۆڕی تایبەت لەیەکتری جیا دەکرێنەوە، سەرەڕای جیاوازییەکانیان بلام هەمویان بە یەك فەرمان کاردەکەن، کار و، پیشەکان

بەسەریاندا دابەشکراوە، هەریەکە ئەرك و، مافی خۆی هەیە و، بە یاسای پابەندبونی سەربازی بەڕێوە دەچن.

## مانای سازان:

کاتێك هەر زیندەوەرێك شتێك پاڵی پێوەدەنێت بۆ ئەنجام دانی کارێك، بۆ تێرکردنی ویستەمەنییەکانی ئەو کارەدەکات، ئەم چالاکەیەی کە زیندەوەرەکە دەیکات دەبێتە هۆی تێربونی ویستەمەنییەکانی، بەمەش دەوترێت نەریتی سازان.

## دەروون دروستی لە کۆمەڵگەی سەربازیدا:

زۆربەی پزیشکانی دەروونی ئاماژە بەوەدەدەن کە نەخۆشی عەقڵی و، دەروونی لە ئەنجامی هۆکاری تایبەت لەلایەن هەر تاکێکەوە توشی دەبێت، بیرۆکەی دەروون دروستی ئەوەیە کە هەریەکەمان توشی هاو شێوەی ئەو کێشەی دەبێت کە لەبەردەمیدا توشی ترس دەبین، توشی لەدەست دانی هزری دەبین، یان بەهۆی خەمۆکی و، پەشۆکاوی دەروونی، بەهۆی شەڕەوە بێت یان بریکردنەوە لە هۆکارێك، هەمیشە لە گلەیی کردن و، سکاڵاکردنداین، ئیدی ئەمە دەبێتە وێستگەیەکی ترسناك بۆ ئەوەی هەمیشە لە یادمان بێت و، دروستی دەرنیمان تێك بچێت.

## کاردانەوەکان:

دیاردەیەکی دەروونییە کە بەهۆی جوڵە جەستەییەکانەوە دروست دەبێت و، جیا دەبێتەوە، وەك ئەو جوڵانە وایە کە بەهۆی دیاردە ناخییەکانەوە دروست دەبێت، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ هەست بە ڕوکەشی دەکەیت، بەهۆی جوڵە سەیرەکانییەوە هەست بەوە دەکەیت بەرامبەر توشی شتێك بووە.

زانای دەروونناسی ئەمەریکی (ولتر کافون) زیاد لە پەنجا ساڵە ئاماژە بەوە داوە، پەیوندییەکی بەهێز هەیە لە نیوان کارەکتەرە فیسۆلۆژی و، کاردانەوەکانی مرۆڤ بۆ ڕوبەڕوبونەوەی کارە لەناکاوەکان. تویژینەوەکان ئاماژە بەوەدەدەن، بەهۆ تورەبون، یان ترس شوێنەواری جەستەیی دیاری کراو لەسەر کەسەکە دادەنێت.

## ئەو دیاردانەی کەبە هۆی کاردانەوە لە ناو کۆمەڵگەی سەربازیدا دروست دەبێت:

١- توڕەبون و، شەڕانگێزی:

## لیوای یەکی پاراستنی سلێمانی

بەوە دەناسرێتە وە کە بە ڕێژەیەکی زۆر بەرز چالاکی لە ئەندامی دەماری و، هەستی مرۆڤ دروست دەکات، کە خۆشنود نییە بەرامبەر ئەو هەڵەیە یان ئەو ڕاستیەی بەرامبەری گیراوەتەوە بەر.

دوژمنکارانە و شەڕانگێزی، واتە: هەر کارێك ئامانج لێی زیان گەیاندن بێت بە خەڵك و، کەرەسەت و، پێداویستییەکانیان، کە بەهۆی ڕاهێنانی جەستەییەوە دروست دەبێت، کەسەکە هەمیشە ئارەزوی تۆڵەکردنەوە و، ئاژاوە گێڕی هەیە بەرامبەر ئەو ناخۆشیانەی لە ڕاهێنان و، پاسەوانی زۆر و، ئێشکگرت بێزار بووە و، بەم شێوەیە بێزاری خۆی دەردەبڕێت. ئەمەش وادەکات زۆر لە سەربازەکان گیانی دوژمنکارانەی و، یاخی بون و، تێکدانیان لادروست دەبێت.

**چەند هۆکارێك هەیە کە سەرباز دەتوانێت لەکاتی جەنگدا بیان خاتە پێشچاوی بۆ بەدەست هێنانی:**

أ- بونی بنەمایەك بۆ ئەوەی لەپێناوی بجەنگێت، بە بڕوای خۆی ئەو بنەمایە زۆر دروستە.

ب- بەهۆی ئەو ئازارەی توشی بووە ئێستا سروشتێکی دوژمن کارانەی بۆ دروست بووە، بۆ ئاسانکردن و، سوککردنی

ئەو ئازارانە پێویستی بەخاڵی کردنەوە هەیە، بۆیە جەنگان لە پێناو وڵاتدا باشترین و، شەرعی ترین تیۆریایە بۆ ئەوەی توندوتیژییەکانی تیا پیادەبکات.

ج- پیادەکردنی فەرمانە سەربازییەکان، سەربازە بەهۆی ئەوەی جەنگ پیشەی خۆیەتی لە پێناویدا دەجەنگێت، هەموو توانا هونەری و، بەهرەمەندیەکانی بەکاردەهێنێت بۆ ئەوەی پارێزگاری لە توانای خۆی بکات.

٢- ترس و، هەڵهاتن:

ترس کاردانەوەیەکە پەیوەندیەکی بەهێزی هەیە بە عەقڵەوە، بەتایبەتی پەیبردن بە شتەکان، جەستەش دەکەوێتە ژێر کاریگەری عەقڵییەوە، بەهۆی بیرکردنەوە و، بەرفەرمانکردن و، کاریگەری دەروون و، کار دەکات لەسەر ترسان لە ڕوداوێکی دیاری کراو.

سەرباز کە یەکەمجار دەڕواتە شەڕەوە هەستێکی سەیری هەیە، هەرچەند ئەمە هەستی هەموو سەربازێکی نوێیە کە یەکەمجار بەشداری شەڕی کردووە، هەروەها سەربازەکانی دوژمنیش هەمان هەستیان هەیە.

**کاتێك سەرباز هەستی بە ترسکرد ئەوکاتە توشیی شڵەژانێك دەبێت، بەڵام ئەگەر توانی ئەو شڵەژانە لابەرێت ئەوە سەرکەوتودەبێت، بەڵام ئەگەر نەیتوانی لایبەرێت ئەوە ترسەکە زیاتر باڵ دەکێشێت بەسەریدا و، زیاتر لەبەردەم ترسەکەیدا چۆك دادەدات.**

**شتێکی ئاساییە کە هەموو زیندەوەرێك –مرۆڤ بێت یان ئاژەڵ– لە هەندێك هەڵوەستەدا بترسێت، بەتایبەت کاتێك زانی مەترسی لەسەرە، باشترین هۆکار ئەوەیە کە بەهیچ شێوەیەك دەری نەبڕێت بۆ ئەوانی دیکە، شاردنەوەی باشترین چارەسەرە.**

**باشترین ڕێگە چارەش گرتنە بەری ئەم ڕێگایەی، بۆ ئەوەی بشێوی لە ناو یەکەکەدا لەناوبەرێت:**

**أ– فەرماندە:**

**فەرماندە لە ئاستی پێشەنگیدایە بۆ بەردەستەکانی و، بەرپرسی تەواوی یەکە و، پێکهاتەکەتی، سەرجەم کارە ئیداری وتەکنیکی و، مەعنەویو کەسییەکانبۆ ئامادەکاری جەنگ لە ئەستۆی ئەودایە.**

ئالێرەوە گرنگی هەڵبژاردن و، دەست نیشان کردنی فەرماندە دیاری دەکرێت لە کاتی جەنگدا، بەتایبەت کاتە مەترسیدارەکان بۆ ڕوبەڕو بونەوەی دوژمن.

ب- ڕاهێنان:

ڕاهێنانی باش هۆکارێکی دروستە بۆ سەرکەوتن بەسەر هۆکارەکانی ترس و، بیم، پێویستە بەم شێوەیە گرنگی پێ بدەین:

١- گەشە پێدانی توانا بنەڕەتییەکان و، بەکارهێنانی چەك بە شێوەی پێویست.

٢- بە ئامانجی ڕاهێنان لەسەر زیاتر چاوکراوەیی لای تاکەکان، بەتایبەت بەکارهێنانی چەکی دوژمن و، هۆکارەکانی جەنگ کردنیان.

٣- گەشە پێدانی بەهرەمەندییە تەکتیکییە فرە چەشنەکان، مەبەست سەرجەم ئەو پڕۆسە جیاوازانەیە کە لەکاتی هێرش و، بەرگری و، ئەنجامی دەدەن.

٤- ڕاهێنان دەبێت لە کەشێکی هاوشێوەی کەشی جەنگدابێت، ئەوەی پێی دەوترێت: خۆراکی جەنگ، واتە

بەکارهێنانی ئاگری زیند و، نزیکی سەربازەکان لە کاتی ڕاهێناندا.

٥- ڕاهێنان لە ژێر کەشی ماندوێتی و، پەستانی دەروونی.

ج- پێویستی بەڕێوەبردنی پێویست بۆ یەکە:

ئەگەر لەکاتی جەنگدا لەڕوی چەك و، تەقەمەنی و، کەرەستەی پێویستی جەنگی نەبێت لەگەڵ خواردن و، پێداویستی دیکە بۆ سەربازەکان، ئەوە کاریگەری نەرێنی و، بارگرانی لەسەر سەربازەکان دروستدەکات و، کاردەکاتە سەر گیانی مەعنەوەیتی تاکەکان.

د- نۆرینی باش و بەردەوام بە تەواوی هۆکارە بەردەستەکان، لەسەر شوێنی دوژمن و، جوڵە و، چەك و، خێریایی شکاری بۆ ڕوداوەکان، ئەمە بچوکترین ئاستە بۆ ئەوەی توشی حاڵەتی لە ناکاو نەبیتەوە.

س- گرنگی دان بە بەرزکردنەوەی گیانی مەعنەوی لای سەربازەکان.

ز- کارکردن بۆ کەمکردنەوەی کاردانەوەکانی ترس، چونکە ترسیش هەمان کاردانەوەی هەستەکانی دیکەی هەیە، پێویستە سەرباز تەواوی کەرەستەکانی ساز و، ئامادەبێت.

٣- دوودڵی و، شپرزەبوون:

دوودڵی بەوە جیا دەکرێتەوە کە بەر لە ڕودانی مەترسییەکە هەست بە پەشۆکاوی دەروون و، نیگەرانی دەکەیت، یەکێکە لەو کاردانەوانەی کە تاك لە ژیاندا پێی دەناڵێنێت، ئەوەیش وەك هەموو کارەدانەوە سروشتییەکانی ناخی مرۆڤە، وەك: خەمبار و، دڵخۆشی و، ترس وایە.

زۆر جار سەرشاوەی ئەو نیگەرانیەی کە جەستەی داگرتوە و، هەست بە ترس دەکات ناڕونە و، دیار نییە.

دوودڵی لەسەر ئەنجام دانی کارێك ئاسانە، بەڵام توشی کێشە دەبیت کاتێك ویستت دوو کار ئەنجام بدەیت، بەتایبەت کاتێك پێویستی بە بیرکردنەوە هەبوو، زۆر نیگەرانی بوون کارەسات بەسەر مرۆڤدا دەهێنێت، (جون مویللر) توێژینەوەیەکی ئەنجام داوە کە باسی ئەوە دەکات لەو حاڵەتانەی مرۆڤ زیاد لە پێویست دوو دڵ دەبێت کەمتر زیانیاری

کۆ دەکاتەوە لەسەر ڕوداوەکە وەك ئەو کەسانەی کە کەمتر نیگەران دەبن.

ئەوانەی کەمتر کاردانەوە دەکاتە سەریان، کەمتر کاردەکەن بۆ گۆڕینی پلانەکەیان، لەو کەسانەی کە زۆرتر کاریگەری لەسەریان دروست دەکات و، هەوڵی گۆڕینی پلانەکەیان دەدەن.

٤- سروشتی دوودڵی:

نیگەرانی لای ئەم دوو تاقمە کۆمەڵێك کاریگەری هەیە، ئەوانیش:

أ- ئەو زانیارانەی کە کاتی هاتنی دەزانێت:

وەك نزیك بونەوەی کاتی تاقیکردنەوە و، ڕۆشتنە ناو جەنگ، ئەم پەشۆکاوی دەروونیانە پێی دەوترێت پەشۆکاوی بابەتی.

ب- ئەو کۆمەڵە کاریگەریە کە تاك هەستی پیێ ناکات و، نازانێت کەی ڕودەدات:

ئەوەیە کە تاك هەست دەکات لە ئان و ساتدا هێرش دەکرێتە سەری، بەڵام نازانێك کەی و، سەرچاوەی هێرشەکە کوێیە.

ئەم جۆرە نيگەرانييە پێى دەوترێت پەشۆكاوى دەمارى، هەميشە خاوەنەكەى هەست دەكات لە مەترسيدا و، توشى پەشۆكاوى كاردانەوەى نەرێنى دەروونى دەبێت، وادەكات ناهاوسەنگى و، نەسازان لە ناخى تاكەكاندا دروست بكات.

## نەخۆشييە دەروونييەكان:

زۆرجار فەرماندەى يەكە يان كەتيبە توشى ڕوداو گەلێك دەبن، لە كاتى ئاشتى و، جەنگيشدا، تاكەكانى يەكەكە كۆمەڵێك كارى سەير ئەنجام دەدەن، ئيدى دەربارەى ئەو نەخۆشييەى خۆيان دەدوێن، نەخۆشييەكى ڕاستييە، يان خۆيان بەخۆيان دەڵێن نەخۆش.

زۆرجار دەبيستين كە ئەندامانى ئەو يەكە بە توندى كاريان لەسەر ئەم جۆرە ڕوداوانە كردوەتەوە و، دژيان جەنگاون بۆ ئەوەى بگەڕێنەوە بۆ ئەنجامدانى ڕەفتارێكى گونجا و، وپابەندبون بە ڕێگەى گونجاو.

## ئەو نەخۆشيانە:

١- پەشۆكاوى دەروونى، پێشتر باسمانكرد.

٢- هستريار:

نەخۆشییەکی دەروونییە کە چەند نیشانە و، هۆکارێکی لەسەر دەردەکەوێت، نەخۆش کار دەکات بۆ ئەنجام دانی کارێك، بەڵام نازانێت چۆن ئەو کارە وێنا بکات و، بەبێ بونی زانیاری دەکەوێتە ناویەوە و، بۆچی ئەوە ڕویداوە؟

ئەم نەخۆشییە بەوە جیا دەکرێتەوە، نەخۆش واهەست دەکات نەخۆشییەکی ئەندامی هەیە، هەمیشە نەخۆش هەست دەکات بەهۆی ئازاری ئەندامیێکییەوە توشی ئەو نەخۆشییانە بووە و، کار دەکات بۆ ئارام بونەوەی دەروونی خۆی.

دەرکەوتنەی هستریا، لە دەر ئەنجامی زیاد دوو دڵی، لەسەر نەخۆشەکە دەردەکەوێت، نەخۆش پێویستی بە هەندێك زیاتر لە سۆز و، خۆشەویستی هەیە.

هەمیشە هەوڵ دەدات نەخۆشەکە، بۆ لای ئەو شتە ڕابکێشێت کە نەخۆش هەستی پێناکات.

## نیشانەکانی نەخۆشی هستری لەم دیادانە دەردەکەوێت:

١- جوڵە دیارەکان:

ناسروشتییەکی زۆر بەمامەڵەکردنیەوە دیارە، هەڵەشەیی و، واتە هەرچی ڕوکەشی ئەرێنی مرۆڤەکەیە دەگۆڕێت بۆ دیمەنی

نەرێنى، وەك كەسێكى ڤێ لێهاتوو زۆر جار درەدەكەوێت و، دەجولێت.

٢- هەستياربوون:

وەك زۆر هەستيارە، يان نيگرانە، يان هەندێك هەست لە دەست دەدات، وەك: بيستن و، بينين، يان لە دەست دانى ئارەزوى نان خواردن و، يان ئاو خواردنەوە ياخود ڕشانەوە لە كاتى خواردنيان.

٣- دياردە عەقڵييەكان:

وەك لەدەستدانى يادگە و زەهايمەر، وەك ئەوەى تاكەكان يادگارييەك لەبير دەكات، يان گەشتێك دەكات نازانێت چۆن ڕۆشتوە و، چۆن هاتووە.

لە زۆر ئەو دياردانەى كە شوێنەوار بەسەر مرۆڤدا بەجێ دەهێڵن، يان بۆ هەميشەيى ئەو شوێنەوارە دەڕوات، زۆر جار هەسترياكە دەبێتە هۆى دروستكردنى كاريگەرى لاوەكى، وەك خەمۆكى يان لە ڕوى جەستەييەوە دەبێتە هۆى هەڵاوسانى خانە مێشكييەكان و، هەڵاوسانى شادەمارەكانى مێشك، زۆر پێويستە گرنگى بە نەخۆشييە دەروونييەكان بدەين زياتر لەوانەى توشى هسترى بونەتەوە.

# پەستانی دەروونی لە ژیانی سەربازیدا :

کارەساتەکانی جەنگ گرنگترین ئەو پەستانانەن کە لە ژیانی سەربازیدا دەردەکەوێت، ئیدی لە کاتی جەنگدا بێت یان ئاشتی، بەکورتی لێرەدا باسیان دەکەین:

١- دیلبون:

ترس لە کەوتنە دەستی دوژمن کارێك سەربازەکان ماندو دەکات، بەتایبەتی ئەوکاتەی کە وێنای دەکەیت لە ناو بەندکراوانی دیل یان سەربازە بەدیل گیراوەکاندایت. چونکە وا دەبینیت کە زۆربەی وڵاتان پابەند نین بە یاساکانی مامەڵەکردن لەگەڵ دیلەکاندا.

لە ڕۆژ هەڵاتدا دیلی جەنگی یەکێکە لە بنەما سەرەکییەکانی ترس لە بەدیلی گرتنیان، بەهۆی بونی ترسی شۆردنەوەی عەقڵ و، گۆڕینی بیروباوەڕ و، مەزهەب، وادەکەن کە دیلەکە بیروباوەڕ و، سیاسەتی خۆی بگۆڕێت ئەمەش ماندوێتی دەروونی و، عەقڵی بەدوادادێت.

هەرچەند ئەوەی لە سەربازگەکانی نازیدا ڕوی دەدا بە چەند هێندە بارگرانتر و، مەترسیدارتربو لەسەر بەندییەکان وەك لە بەندینخانە سەربازییەکانی ڕۆژهەڵات.

٢- دورکەوتنەوە لە خێزان:

تاکەکان بەهۆی دوریان لە ماڵەوە، بۆ ئەنجام دانی ئەرکو فەرمانەکانیان لە خێزانەکانیان دور دەکەونەوە، دورکەوتنەوە لە خێزان دیاردەیەکی دەروونی لای تاکەکان دروست دەکات، بەتایبەت ئەوانەی کە هاوسەرگیریان کردوە و، منداڵیان هەیە، ئافرەتیش توشی پەستانێکی کۆمەڵایەتی زۆر دەبێتەوە، کاتێك هاوسەرگیری لەگەڵ ئەندامێکی هێزە چەکدارەکان دەکات.

٣- ترس لە برینداربوون:

هەندێك سەربازی هەیە توشی دڵەڕاوکێ دەبن بەهۆی ترسی برینداربوون و، پێکانیان هەیە و، زۆر جار دەبێتە هۆی مردنیشیان، وەك مانۆڕی سەربازی یان پیادەکردنی ئەرکەکانیان، بۆ نمونە: فڕۆکەوان و، هێزە تایبەتەکان و، ئەو هێزانەی کە بە پەڕەشووت لە پشتی هێزەکانی دوژمنەوە دادەبەزن، گیانی مەعنەویەت هەرچەند بەرز بێت، بەڵام پاڵنەرێکی سروشتی هەیە لای تاکەکان بۆ مانەوە لە ژیان.

بۆ نمونە: فڕۆکەوانێك هەموو جارێك توشی ڕوداوێکی شەهید بونی هاوپیشەیەکی فڕۆکەوانی هەیە، بەشێوەیەك

هەمووجارێك كە دەر دەچێت بەخۆی دەڵێت: (ئەمڕۆ نۆبەی كاممان بێت؟) ئیدی تاكەكان توشی پەشۆكاوی و، دوودڵی دەبن.

ئەم هەستەش وادەكات كە تاكەكان هەست بە تاوان و، پەشیمانی و، پاشەكشێ و، دەست لە كار كێشانەوە بكەن.

بەڵام ئامۆژگاری و، ڕاسپاردەی دینی بنەمایەكی سەرەكییە بۆ ئاراستەكردنی ورە بەرزی و، مەعنەوی.

٤- خانەنشین بوون:

یەكێك لەو هۆكارانەی كە كار لەسەر دەروون دروستی تاكی سەربازی دەكات، بەتایبەت ئەفسەران، خانەنشین بوونە لە تەمەنێكی كورت و، كەمدا، بەتایبەت ئەگەر تەمەنی كەسەكە لە خوار پەنجا ساڵەوەبێت، چونكە ئەوكاتە هێشتا خاوەنی توانایەكی جەستەیی بەرزە، توانای ئەنجام دانی كاری هەیە.

خانەنشینی لەم كاتەدا بە ئەزمونێكی ناخۆشی پیاو دادەنرێت، چونكە تاك زۆربەی كاتەكانی بەبێ كار بەسەر دەبات و، ئەمەش توشی نیگەرانی دەكات.

ئەوە جێگەی باسە كاركردن بریتییە لە سەلماندنی خود، بەتایبەت لە بواری سەربازیدا، كاتێك لە بارودۆخێكی باشی

ژیاندا دەتگەڕێننەوە بۆ بارودۆخێکی ئاسایی توشی دڵتەنگی و، نیگەرانی زۆر دەبێتەوە. بەتایبەت کە ژیانێکی زۆری لەو پێناوە خەرجکردووە و، لەپڕدا دەیگوازنەوە بۆ خانە نشینی.

## پەشۆکانی دەروونی لەسەر بەشداربوانی جەنگ:

چەندین پەشۆکان و، پەستانی دەرنی لەسەر ئەوانە دروست دەبێت کە لە جەنگدا بەشداری دەکەن. زۆربەی ئەوانەی کە گرنگیان بەم بابەتە داوە بۆیان دەرکەوتوە ماندوبون و، پەشۆکان و، وەرسبونی زۆر لەسەر دەروون و، عەقڵی ئەو کەسانە دەرکەوتووە، یان ئەوانەی لە جەنگدا توشی برینداری گەورە بونەتەوە. ئەو کەسانەی کە لە جەنگی جیهانی دووەمدا لە ناو سوپای ئەمەریکا توشی شڵەژانی دەروونی بونەوە. لای برادەران و، هاوڕێ و، هاوڵاتیانی ئەمەریکا وەك ترسنۆك لەگەڵیان نەجوڵانەوە، بەڵك بەشێوەیەکی مرۆیی مامەڵەیان لەگەڵ دەکردن.

لە میانەی جەنگی جیهانی یەکەمدا ئەمەریکییکان دەستیان کرد بە دانانی پزیشکی دەروونی و، گرنگی زۆریان پێدا.. بەتایبەت بابەتی فەرماندەیی، ئەوانەی توشی فەرماندە دەبنەوە، کۆبیریان خستە سەر هەڵبژاردنی ئەو فەرماندانەی بۆ جەنگ دەگونجێن و، ئەوانەی ناگونجێن. فەرماندەی جەنگی پێویستە خاوەنی کەسێتییەکی تایبەتی بێت، متمانەی بەرزبێت، توانای کۆنتڕۆڵ کردنی دەروونی هەبێت، توانای بڕیاردانی گونجاوی لە

کاتی گونجاودا هەبێت. هەندێك كەس هەیە سەرەڕای ئەوەی كە توانای ڕێكخستنی و، گرنگی پێدانی هێزی هەیە، بەڵام ناگونجێت بۆ ئەوەی بیكەیتە فەرماندە لە جەنگدا.

كەسی دوودڵ و، ڕاڕا هەرچەند زۆر باشن بۆ ئەوەی هێز ڕێكبخەن و، بەڕێوەی بەرن، بەڵام ناگونجێت بۆ ئەوەی لە جەنگدا بیكەیتە فەرماندە.

هەروەها كەسێك كە بەهاندان هەڵەشە دەبێت، كە ئەمە وادەكات زیادەڕۆیی بكات لە ئازایەتییەكەی، هەرچەند ئەم جۆرە كەسانە لە شوێنی دیاری كراودا زۆر پێویستن، بەڵام پسپۆڕانی درەوین باسی ئەوە دەكەن كە ئەم جۆرە كەسانە پێویستە لە جەنگدا بەشداری نەكەن وەك فەرماندە.

# دەروازەی هەشتەم

# جەنگى دەروونى

## پێشەكى

ڕۆژێك نييە كە گوێ بيست نەبيت، يان شتێك نەخوێنينەوە لەسەر جەنگى دەروونى، بەتايبەت لە قەيرانە يەك لەدواى يەكە سياسى و، سەربازيى و، ڕوداوە فرە چەشنەكانى ئەم ڕۆژگارەماندا، زۆر شتيشمان لەسەر شيكارى بۆ ئەم دەستەواژەيە خوێندوەتەوە، زۆر جارئەو قەيرانە جيهانيانە بەهۆی جەنگى دەروونييەوە دروست دەبێت، چونكە جەنگى دەروونى چەند كەسێك بەشدارى لەدروست بونى دەكات، پێكدێن لە:

أ- پەيامنێر: ئەو لايەنە و، ئاراستەيە كە جەنگە دەست پێدەكەن و، بڵاوى دەكەنەوە، كە خۆی لە دەوڵەت، يان لايەن، يان گروپ و، كروپۆچكە دەبينێتەوە.

ب- پەيام: خود و، كرۆكى جەنگە دەروونييەكەيە.

**ت- نێوەندگیر: ئەو هۆكار و، ئامێرە بەكارهاتوەن كە پێكهاتەی جەنگی دەروونی دەگەیەننە گروپی بەرامبەر، یان ئەو شوێنەی مەبەستیانە، سەرجەم هۆكارەكانی بانگەشە بەكار دەهێنن بۆ لاو بونەوە.**

**ز- ئامانج: بۆ بەدی هێنانی مەبەستێكی ناوەڕۆك دار جەنگی دەروونی ئەنجامی دەدەن، ئەم ئامانجە بەهۆی جیاوازی مەبەستی جەنگی دەگۆڕێت.**

**بەگشتی كار دەكات بۆ لاوازكردنی گیانی مەعنەوی لای تاكەكانی كۆمەڵگە و، كاریگەر لەسەر پەیوەست بون و، سازانیان دروست دەكات، ترس و، بیم و، دڵە ڕاوكێ و، پەرێشی دروست دەكات، لایەنی پەیوەندیدار بە جەنگە درەونییەكە دەیەوێت بەم هۆیەوە چەند بیرو بۆچون و، لێكترازان دروست بكات و، ئەوەی دەیەوێت بی سەپێنێت.**

**چەندین ڕەهەند بەشداری دەكات لەم جەنگەدا، لایەنی هونەری و، دەروونی و، كۆمەڵایەتی و، ڕامیاری.**

**بەكارهێنانی جەنگی دەروونی تەنها لە كاتی شەڕدا نییە، بەڵكو تەنانەت لە كاتی ئاشتیشدا ئەنجام دەدرێت، دیاردەیەكی گشتگیرە و، پەیوەندی بەكاتێكی دیاری كراوەوە نییە، بەڵام بەر**

لە دەست پێکردنی جەنگ و، لە کاتی جەنگ و، دوای جەنگیش بەردەوام دەبێت، ناتوانیت دۆست و، دوژمنی تیا بناسیت، وەك جەنگی دەستەو یەخە وایە، کە چەند هۆکارێك دەگریتە بەر لەکاتێکدا نازانیت ئامانجە ڕونەکەت چییە، زۆر جار لە پشتی دین و، یان پەیوەندی ئاسایی و، بەها مرۆیی و، ئازادی ڕۆژنامەگەری و، پەنابردنە بەر گاڵتە و، بڵاو کردنەوەی دەنگۆ دەبێتەت پاڵپشتێکی باش بۆ دەستکردن بە جەنگی دەروونی و، خۆ شاردنەوە لە تەنیشتی.

بۆیە زۆر ئاسان نییە کە بتوانین بابەتی جەنگی دەروونی لە شتێکدا کورت بکەینەوە، لەوەش ئەستەمتر ئەوەیە کە ناتوانین بی ناسینەوە.

## جیاوازی تێگەیشتن لە جەنگی دەروونی:

ئەمڕۆ جەنگی دەروونی یەکێکە لە پایە سەرەکییەکانی کاری سیاسی و، سەربازی هەموو وڵاتێکی پێشکەوتوو، بەهۆی بەردەستبون و، ئەو پێشکەوتنە گەورەیەی هاتوەتە ئاراوە، دەبینین زیاترپەرە بە هۆکارەکانی بڵاو کردنەوە جەنگی دەروونی کراوە لە ناو کۆمەڵدا، تاك لە ناو کۆمەڵدا بێت یاخود بەتەنها بێت زیاتر جەنگی دەروونی بەکار دەهێنێت، چونکە هۆکارەکانی پەیوەندی و، تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان خەریکی دروستکردنی

## لیوای یەکی پاراستنی سلێمانی

کاریگەرییە لەسەر ملیۆنان مرۆڤ، لە بابەتێکیدیاری کراودا یاخود لە هەر بابەتێکدا کەسەکان پسپۆڕیان تیایدا هەیە.

دەبینی ئەمەرییەکیەکان بەملیۆنان کارمەندی تەرخان کردوە بۆ بەرپاکردنی جەنگی دەروونی، کەلەسەر نەمایەکی خوێندنەوەی باشی کۆمەڵگا جەنگەکە بەڕێوەدەبەن، (شفازنز)ی دەروونناسی گەورەی ئەمەریکی پێی وایە کە جەنگی دەروونی لە تەواوی ڕشتە و، چین و، توێژەکان بۆ بەدی هێنانی ئامانجێکی دیاریکراو کاردەکەن، بۆ ئەوەی گیانی مەعنەوی دانیشتوانی لاتی نەیارانیان لاواز بکەن، شکۆی فەرماندەکانیان بشکێنن، متمانە بە تواناکانی خۆیان نەکەن، لەکۆتایدا کار دەکەن بۆ ئەوەی بۆچونێکی یەك جەنگیان هەبێت لە پێناو ئەو ویستەی ئەوان دەیانەوێت بەبێ ئەوەی گەلەکەیان هەستی پێ بکات.

ئەمەش مەترسیدارترین جۆرەکانی جەنگە، چونکە ئامانجیان عەقڵ و، بیر و، دڵی خەڵکە و، بەرەو شکست بیان بەن. هەمیشە جەنگی دەروونی دژی گروپ و، ڕەوتە چاکسازەکان دەگیرێتەبەر. بەردەوام هەوڵ دەدەن ئەو بیرۆکانەی دەچێنرێت ڕیشە کێشی بکەنو بەبیانوی دروستکردنی دووبەرەکی و، نانەوەی ئاژاوە و، ئاشوب تۆمەت باری بکەن و، لەبەرچاوی

خەڵك بی بێزن، بەدروستکردنی وتە و، وتەلۆك و، دەستی دەرەکی و، شکاندنی شکۆی وڵات تۆمەت باریان دەکەن و، لە تەواوی میحوەرەکانەوە جەنگی دژی ڕادەگەیەنن.

لەسەرەتای مێژووی مرۆڤایەتییەوە جەنگی دەروونی بونی هەبووە، بەڵام چەمك و، تێگەگەشتنەکانی جیاوازیان هەیە، بۆ نمونە: بەریتانییەکان پێی دەڵێن: جەنگی سیاسەت، لەکاتێکدا ئەمەریکییەکان پێی دەڵێن جەنگی دەروونی. (سیر روبرت لوکهارت) بەڕێوەبەری گشتی لیژنە پیادەکردنی جەنگی سیاسی لە جەنگی جیهانی دووەم، دەڵێت: "پیادەکردنی دەنگو و، بانگەشەیە بۆ خزمەتی جەنگ"، هەروەها سەرۆکی ئەمەریکی ئەوکات بە: "دورخستنەوەی هێزی پێشەوەیە لە جەنگی قورس و، ئاسانکردنی ئەرکەکەیان" ناوی برد.

ئەم ڕێگەیە زۆر جیاوازی نییە لە پێناسەکانی جەنگی دەروونی، بۆیە (لادیسلاس) دەڵێت: "جەنگێکی سیاسییە". (جۆن سکوت)، دەڵێت: "ئەو چالاکییەیە کە سوپای پیادەی دەکات، جیاواز لە جەنگی ئاسایی"، هەروەها هێزی دەریایی پێی دەڵێت: "جەنگی تایبەت". لە ساڵی (١٩٥٨ز) پێیان وابو: "مەبەست لە جەنگی ساردە"، واتە ڕاپەڕینی جیهانی لە نێوان ڕۆژهەڵات و، ڕۆژئاوا، لە دوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە ئەم

جەنگە بەردەوامە تا ئێستا، هەرچەند هیچ جەنگێك بونی نییە، بەڵام هێشتا ئەو جەنگەی، کە جەنگی سارده بەردەوامە.

له لایەکی دیکەوە، ئەتوانی بە ڕونتر باسی جەنگی دەروونی بکەین کە: "دانانی ڕێو شوێنێکی سیاس و، سەربازیی و، بیروباوەڕییە کە مەبەست لە نەخشە بۆ کێشانی ئەو کارە، بە ئامانجی کاریگەری دروستکردنە لەسەر هەڵوەستە و، بیروبۆچونی بەرامبەر و، گۆڕی ڕەفتار و، دیدگایەتی بۆ ئەو ئامانجەی دەمانەوێت"، بەڵام زۆر ئەستەمە بتوانین بەوردی بەڵگەکانی جەنگی درەونی دیاری بکەین، بەتایبەت لەم سەردەمەی ئەمڕماندا کە گەشە سەندنی تەواوی لقە مرۆڤایەتییەکان بەرفراوان و، گەورەتربووە، بۆیە دەبینی ململانێ ئایدۆلۆژیا و، تیۆریا فەلسەفییەکان بەربڵاو بونەتەوە، ئێستا ئەتوانین پێی بڵێین، جەنگی وشە، یان جەنگی بۆچونەکان.

کەواتە هەموو ئەو بۆچونانەی کە بەکار دێت بۆ ئەوەی بانگەشە بکات، یان دەنگۆیەك بڵاو بکاتەوە، یان جەنگی سارد بکات، یان جەنگی ئایدۆلۆژیایی بکات، جەنگی بۆچونەکان و، بیرو باوەڕ، جەنگی سیاسەت، جەنگی پشت دەریاکان، جەنگی وشەکان، جەنگی نا ڕاستەوخۆیی، وروژاندن،

كاريگەردروستكردن، هەموويان وەك هاو ماناى جەنگى دەروونى بەكار دێت.

ئەمەريكييكان پێناسەى جەنگى دەروونى دەكەن و، دەڵێن: "زنجيرەك كۆششى يەك لەدواى يەك و، تەواوكارى جەنگى ئاساييە، كە لە ڕێگەى هۆكارەكانى پەيوەندييەوە نازييەكان بەكاريان هێنا، بۆ پيادەكردن و، جێبەجىٚ كردنى ستراتيژيەتى جەنگى خۆيان و، پيادەكردنى سياسەتەكانيان".

(لاين بارجر) پێى وايە جەنگى دەروونى: "بەكارهێنانى بانگەشەيەكە دژى دوژمن، لە ميانەى كارێكى ديكەوە، كە سروشتێكى سەربازى يان ئابورى يان سياسى هەبێت". واتە: سياسەتى ئەو نەتەوەيە هاوكارى ئەو بانگەشە و، دەنگۆيە دەكات، جا ئير ڕاستەوخۆ بەشدارى بكات يان لەڕێگەى كۆمەڵێك خەڵك و، ڕەوتەوە ئەو كارە بكات.

(ئيزونهار) پێى وايە: "جەنگى دەروونى تەنها بەكارهێنانى بانگەشە نييە، هەرچەند ئەوە بەشێكى گرنگى جەنگەكە، بەلاَم هاوكارى ئابورى و، بازرگانى و، پەيوەندييە دۆستايەتييەكان و، تەنهانەت يارييە وەرزشييەكان دەگرێتەوە". بەپێى ئەم بۆچونە بێت دەتوانين بڵێين جەنگى دەروونى بريتييە لە: "ڕاپەڕينە بۆ كۆنترۆڵكردنى عەقڵ و، ويستيى خەڵكەكە".

## لیوای یەکی پاراستنی سلێمانی

پێناسەیەکی نوێ هەیە بۆ جەنگی دەروونی کە: "کۆمەڵە زانیاری و، بیرو بۆچون و، مەزهەب و، ئاراستە و، بانگەوازی تایبەت و، بڵاو کراوەی ڕاگەیاندنە کە بڵاو دەکرێنەوە بۆ کاریگەری دروستکردن لەسەر بۆچون و، بیروباوەڕ و، ئاراستەکردنی ڕەفتارەکانی تاك و، کۆمەڵ و، گەل و، نەتەوەی بۆ ئەوەی ئاراستەیان بکەن بۆ ئەو ئامانجەیان دەیانەوێت".

ئامانجی سەرەکیش بریتیە لە: "سەپاندنی ویستی دوژمنە بۆ ئەوەی بەو ڕێگەیەی دەیانەوێت بەکاریان بهێنن، بەڕێگەیەکی دور لە بەکارهێنانی جەنگ و، سەرباز و، ئابوری، چونکە جەنگی دەروونی وادەکات کە هێزە چەکدارەکانیش هەمان ئامانجیان دەوێت لە بەرامبەر هەبێت".

هەمیشە لە جەنگی دەروونیدا نەخشەکە وایە کە چەند وڵاتێك، یان چەند ڕاگەیاندێکی جیاواز لە وڵاتی ئەنجام دەری جەنگە دەست بکەن بە پیادەکردنی ئەو ویستەی وڵاتە بەکارهێنەرەکە، دەیەوێت لە وڵاتەکەی بەرامبەریدا پیادەی بکات و، کاریگەریان لەسەر دروستبکات، چونکە مەبەست لە جەنگی دەروونی ڕوخاندنی هێزی بەرامبەرە بە هەرشێوەیەك و، لە لایەن هەرکەسێکەوە بێت سود بەئامانجی وڵاتی بەرامبەر دەگەیەنێت.

هەمیشە وڵاتی بەکارهێنەر دەیەوێت بە ئاسانترین ڕێگە و، بەبێ بەکارهێنانی هێز و، توندوتیژی و، شەڕەکە بباتەوە، بۆیە دەبینین هەمیشە ئەنجام دەرانی جەنگی دەروونی لەسەر ئازایەتی و، پیاوەتی و، سازان دروستنەکراوە، زۆر ئاساییە پیاوەکان بە وشە جەنگەکە بەڕێوەبەرن لە جیاتی چەك.

## پێناسەی جەنگی دەروونی:

جەنگی دەروونی بریتییە لە بەکارهێنانی سەرجەم هۆکار و، پیادەکردنی بانگەشە و، دەنگۆکانە بۆ ئەوەی کاریگەری دروست بکات لەسەر مەعنەویاتی بەرامبەر، ئەویش بەهۆی دروستکردنی کاریگەری لەسەر ویست و، ئاراستە و، بیرو باوەڕ و، هەست و، سۆز و، بیرۆکەی بەرامبەر دروستدەکات.

(لینبارجر) پێی وایە جەنگی دەروونی دوو چەمکی هەیە: تەنگ پێ هەڵچنین و، بەرفراوان، چەمکی تەنگ پێ هەڵچنین: "بەکارهێنانی بانگەشەیە دژی دوژمن لەگەڵ پیادەکردنی پرۆسەی سەربازی و، ئابوری و، سیاسی بەوپێیەی بانگەشە دەیەوێت".

بەڵام چەمكی بەرفراوانییەكەی: "پیادەكردنی هەندێك بەشی دەروونناسییە، بۆ هاوكاری ئەو هەوڵانەی لە بواری سیاسی و، ئابوری و، سەربازیدا دەیخەیتە گەڕ".

دكتۆر (نوفل) لە پەرتوكی (جەنگی دەروونی)دا دەڵێت: "كۆمەڵێك كارە ئامانج لێی كاریگەری دروستكردنە، لەسەر تاكەكانی دوژمن بە فەرماندە سیاس و، خەڵكە مەدەنیەكانیشە بە ئامانجی خستنە ناو ئەم جەگە و، كاریگەری دروستكردن لەسەریان".

ئەحمەد بەدر دەڵێت: "جەنگی هێرشكردنە، چونكە سوپای بەرامبەر دەخەیتە ناو جەنگێكی هزری و، سۆزداری لە پێناو شكاندنی هێزی مەعنەویەتی سوپاس دوژمن و، دانیشتوانی وڵاتەكەیان، ئەم جەنگەش بۆ كەمكردنی پێگەی جەماوەری هێزی دوژمن و، شكاندنیانە".

تێگەشتن لە پیادەكردنی جەنگی دەروونی، لە چوار چێوەی زانستیەكەیەوە:

وەك پیادەكردنی جەنگی عێراق، ئەمەریكییەكان لەسەردەمی سەدام حسین دا جەنگێكی دەروونیان بەرپاكرد، بۆیە گۆڤاری (كۆلێژی مەلیك خالید)ی سەربازی دەربارەی ئەم جەنگە دەڵێت:

## لیوای یەکی پاراستنی سلێمانی

**"ئەو جەنگە دەروونیەی کە ئەمەریکیەکان بەرپاران کرد دژی عێراق، بەشێك بوو لە زنجیرەیەك جەنگی دەروونی گشتگیر و، ستراتیژیەتی ئیدارەی ئەمەریکا بۆ هەموو ئەوانەی سەرپێچی بۆچون و، دیدگا و، دەبێتەوە، بەتایبەت وڵاتە ئیسلام و، عەرەبییەکان، ئەویش لە جەنگەکەی بەناوی (جەنگ دژی تیرۆر) دەستی بەم پڕۆسەیەکرد، ئەوەبوو (٢٠٠١) بەهۆی بەرپاکردنی جەنگ دژی ئەفغانستان بە ویستی خۆیان بێت یان بە بیٚ ویستی خۆیان وڵاتان لەژێر بەیداخی جەنگ دژی تیرۆ هاتنە بەرەی ئەمەریکی، تەنانەت ئەو کاتە فەرەنسا ویستی بەشداری شەڕی دژی عێراق بکات، بەڵام ئەمەریکا و، بەریتان و، ئیسپانیا لە (١٠/ ٣/ ٢٠٠٣ن) پڕۆژەیەکیان پێشکەش ئەنجومەنی ئاسایش کرد بەوەی کە جەنگ دژی عێراق بە شەرعی بناسێنن، هەروەها ئەمەریکا جەنگی دەروونی دژی سەرۆکی ئەڵمانیا ڕاگەیاند کە نەیەویست بەشداری ئەو جەنگە بکات، هەروەها کاتێك ڕوسیا ویستی بەشداری نەکات، بەڵام ئەمەریکا بەبیانوی شکاندنی یاسا تۆمەتباریکرد".**

**جەنگی دەروونی بریتییە لە پڕۆژەیەکی گشتگیر کە هەموو هۆکارەکان بەشداری دەکەن تیایدا، بۆ کاریگەری دروستکردن لەسەر بەرامبەر بە ئامانجی شکاندنی هەڵوەستەیەکی دیاری**

کراو یان ڕەفتارێك، بۆ بەرژەوەندی ئەو وڵاتەی پڕۆسەکەی دەست پێکردووە.

## گرنگی جەنگی دەروونی:

سەرەڕای ئەوەی کە جەنگی دەروونی لە مێژەوە خۆی سەلماندووە، لە نێوان هەردوو جەنگی جیهانی یەکەم و دووە و، دوای ئەوانیش هەر بەکار هاتووە، بەڵام لەم سەردەمەدا زیاتر بەکاردێت، پێم وایە لەگەڵ بەرفراوانی هۆکارەکانی ڕاگەیاندن و، تۆڕە کۆمەڵایەت و، جەماوەرییەکان زیاتر بەرفراوان دەبێت، کە بەهۆیەوە ئەتوانێت کاریگەری بکاتە سەر ملیۆنان بەکارهێنەر و، گۆڕینی ڕەفتاریان.

ئەمڕۆ جیهانی عەرەبی و، نەتەوەی کورد لە ژێر کاریگەرییەکی زۆری ئەو جەنگەدایە، کە لە لایەن وڵاتی زلهێز و، ناوچەییەکانەوە دەکرێتە سەرمان و، جەنگ لە دواوی جەنگ توشی نەتەوەکەمانی دەکەن و، کاریگەری کردوەتە سەر پاشەکشێی نەتەوە ویستی و، گیانی مەعنەوی لە ناخی تاکەکاندا.

بۆیە جەنگی دەروونی لەم کاتەدا لە مەترسیدارترین ئەو جەنگانەیە کە لەم ناوچەیە بونی هەیە، تەنانەت لە ئیسلامیشدا جەنگی دەروونی بونی هەیە.

شارەزایانی ستراتیژی سەربازی کۆکن لەسەر گرنگی و، مەترسی جەنگی دەروونی، (جیمس جاین) جەنەڕاڵی ئەمەریکی دەڵێت: "ڕۆژئاوا ئێستا بە دەستی ئەو جەنگە ئایدۆلۆژیاوە دەناڵێنێت کەتوشی بووە، بۆیە جەنگی ئێستا جەنگی دەروونییە، لەم سەردەمەدا جەنگی دەروونی مەترسیدارترین جەنگە دژی مرۆڤایەتی. چونکە جەنگی دەروونی ڕێڕەو و، دەر ئەنجامی زۆر جەنگی گۆڕیوە".

(رومل) دەڵێت: "فەماندەی سەرکەوتو ئەوەیە، بەر لە جەستەی کاریگەری لەسەر عەقڵی دوژمن دەکات".

جەنگی دەروونی بۆ یەکلایی کردنەوەی هەموو کردەوە سەربازییە ئاساییەکان زۆر گرنگی خۆی هەیە... چونکە جەنگی دەروونی چەکێکی زۆر مەترسیدارە، بەڵام چەکێکی دووسەرە.

ئەم سەردەمە زۆرترین چەکێك بەکاری دەهێنن جەنگی دەروونییە، چونکە کاریگەری لەناوبەری هەیەلە بۆ ویست

ومەعنەويەتى سوپاى دوژمن، لە مەترسيدارترين و، گرنترين بابەتەكانى جەنگە هاوچەرخەكانە.

## چەكەكانى جەنگى دەروونى:

جەنگى دەروونى سىٚ چەكى زۆر مەترسيدارى هەيە بۆ بەرپاكردنى، ئەوانيش:

يەكەم: بانگەشە

چەمكى بانگەشە: ئەم چەمكە بەدرێژايى مێژو بۆ چەندين مانابەكارهاتووە، هەرجارەو كۆمەڵێك چاكسازى تيا كردووە، يەكەم كەس كە وشەى (بانگەشە)ى بەكارهێنا پاپا گريگورى يەكەم بوو، ساڵى (١٦٢٢ز) گروپێكى نوێى دروستكرد و، مژدى هاتنى كۆمەڵێكى كرد لە پشتى دەرياوە، ئەم چەمكەش هاوتايە لەسەر ئەوەى كە (مەعزەدينى فاتيمى) بەكارى هێنا كە دواى شەش سەدە لە قەشە گريگور بۆ مەبەستێكى تايبەتى خۆى بەكاريهێنا.

## پێناسەى بانگەشە:

- ماناى بانگەشە: بڵاو كردنەوەى زانياريية.

**- مادەکانی بانگەشە: ڕاستییە، یان درۆیە، یان ئاوێتەی هەردووکیانە.**

**- ئامانجی بانگەشە: گۆڕینی ئاراستەی تاك یان کۆمەڵە.**

**- ئامێرەکانی بانگەشە: ڕاگەیاندن و، تۆڕەکانی پەیوەندی و، ڕۆژنامە و، تیڤی و، ڕادیۆ و...هتد.**

**بانگەشە واتە: هونەری کاریگەری دروستکردن و، بەڕێوەبردن و، کۆنتڕۆڵکردنی و، گۆڕینی بۆچونی بەرامبەر لەسەر ئەو بۆچونەی هەیەت و، گەیشتنە بەو ئامانجەی دەتەوێت.**

**جۆرەکانی بانگەشە: بانگەشە لە ڕوانگەی سەرچاوەییەوە دەکرێت بە سێ بەشەوە، ئەوانیش:**

**١- بانگەشەی سپی: سەرچاوەی بانگەشەکە دیارە، هەمیشە بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی شکۆمەند و، باش هەنگاو دەنێت، ئەو بانگەشەی بۆ بڵاو کردنەوەی ڕۆشنگەری و، ڕاگەیاندنی دروست کاردەکات.**

**٢- بانگەشەی ڕەش: سەرچاوەکەی دیار نییە، زۆر جاریش سەرچاوەکەی زانراوە، بەڵام ڕاستییەکی نییە واتە کەس نازانێت**

سەرچاوەى ئەو دەزگايە كوێيە، يان بەهۆى كۆمەڵێك بانگەشەى خودا و، نيشتمان و، ديموكراتى وئازادى و، شۆڕش ودادگەرى پيادەى دەسەلاٌتى (ديكتاتۆرى و، فريودان و، داگيركارى وپاوەند خوازى پيادە دەكەيت، يان بەكارهێنانى كاريكاتێر بۆ تۆمەت و، ناو زڕاندن بەكار دەهێنرێت و، سەرچاوەكەى ديار نييە.

٣- بانگەشەى خۆڵە مێشى: ئەم جۆرە بانگەشانە هەرچەند سەرچاوەكەى دياركراوە و، زانراوە، بەلاٌم ئامانجيان گەياندنى كۆمەڵێك مەبەسەتى خۆيانە، كە لە ژێر پەردەى جۆراو جۆردا دەيانەوێت پەيامەكەيان بگەيەنن و، يارى بە نەتەوەو و، چين و، توێژەكان بكەن.

## هەروەها بانگەشە لەڕوى كاتەوە دووجۆرە:

أ- بانگەشەى ستراتيژى:

بۆ دژى سوپاس دووژمن و، نەتەوەكەى پيادە دەكرێت، ئەم جەنگەش بۆ دروستكردنى كاريگەرى ڕاستەوخۆى لەسەر خەڵكى ئەو ناوچەيە بەكاردێت، ئامانجى سەرەكى گۆڕينى سايكۆلۆژى و، دەروونى دوژمنە.

ب- بانگەشەى تەكنيكى:

بۆ كاريگەر دروستكردن لەسەر ئەوكەسانەی كە گوێيان لێيە و، بۆ ژمارەيەكى دياريكراو بەكاردێت، بۆ ماوەيەكى كورت و، ديارى كراو بەكار دێت، جياواز لە بانگەشەی ستراتيژى كە درێژ خايەن و، ديارى نەكراوە.

دووەم: پڕو پاگەندە و، دەنگۆ.

دەروونناسان و، توێژەرانى بوارى دەروونى دەنگۆ بە هۆكارێكى سەرەكى و، گرنگى جەنگى دەروونى دادەنێن، بەڵكو چەكێكى لەناوبەرە، يەكێك لە تايبەت مەندييەكانى ئەوەيە كە خێرا بڵاو دەبێتەوە، ڕيزەكان لاواز دەكات، يەك جەنگى پەرش دەكاتەوە، دەروونى جەماوەر دەهەژێنێت، متمانەيان بەدەسەڵات و، فەرماندەكانيان نامێنێت.

سەرەتا پێناسەی دەنگۆ دەكەين و، دواتر باسى بەرگرى و، ڕێگريەكانى دەكەين، پاشان سەر لەو هۆكارانە دەدەين كە دوژمن بەكارى دەهێنێت بۆ بڵاو كردنەوەی.

پێناسەی دەنگۆ: "واژەيەكە كە جەخت لەسەر بابەتێكى ديارى كراو دەكاتەوە بۆ ئەوەی هەركەس گوێبيستى بوو بڕواى پىێ بكات، لە كەسێكەوە بۆ كەسێكى ديكە دەگۆڕێت، زۆر جار كەسەكە ئەو دەنگۆيە بڵاودەكاتەوە بەبىێ ئەوەی بزانێت ئەم كارە

لە بەرژەوەندی دوژمن دەکات و، بەبێ بونی بەڵگە دەماو دەم بڵاوی دەکاتەوە".

**بە پێی ئەم پێناسە دەنگۆ لە سێ بەش پێك دێت، ئەوانیش:**

– بابەتێکی دیاریکراوە و، بەشێوەیەکی مەبەست خراوەتە ڕوو.

– تاکەکان ئەم بابەتە بڵاو دەکەنەوە.

– بڵاو بونەوەی دەنگۆ پێویستی بە بەڵگە و، سەلماندن نییە.

لەمیانەی باسەکەماندا ئەندازە و، ڕۆڵی هەریەکە لەم سێ پێکهاتەیە باس دەکەین کە بۆ بەدی هێنانی ئامانجەکانی دەنگۆ دەیگرتنەبەر.

## ئامانجەکانی دەنگۆ:

**ئەتوانین لەم خاڵانەدا کورتی بکەینەوە:**

١– هێزی مەعنەوی و، ورەی بەرامبەر دەشکێنێت، ئەویش بە بڵاو کردنەوەی دووبەرەکی و، ناکۆکی و، متمانە نەبوون بەیەك لە ناو تاکەکاندا یان لەناو فەرماندە و، سەربازەکانیدا.

٢- توندوتيژى و، بڵاو كردنەوەى ترس و، تۆقاندن لەناو ڕيزەكانى سوپادا.

٣- دەنگۆ وەك بەربەستێكى دوكەڵى بەكار دەهێنن بۆ شاردنەوەى ڕاستييەكان، زۆر جار يەكێك لەلايەنەكان هەندێك زانيارى بڵاوە پێدەكات لە ناو سوپاى دوژمندا بۆ ئەوەى دوژمن ڕاڕابێت و، نەزانێك ئەمە ڕاستييە يان نا، بۆيە دەنگۆ تواناى شاردنەوەى ڕاستييەكانى هەيە.

٤- دەنگۆ دەتوانێت هێرشى پێچەوانە بكاتە سەر سەرچاوە هەواڵييەكانى دوژمن و، دروستكردنى گومان لەسەريان.

## دەروونناسان دەنگۆ بۆ سێ جۆر پۆلێن دەكەن:

١- دەنگۆى كشاندن: ئەو جۆرەيە كە بەسستى و، بە نهێنى بڵاو دەبێتەوە، واتە بەئاسپايى و، بەسەرخۆيى دەماو دەم دەگوازرێتەوە و، ماوەى بڵاو بونەوەى درێژخايەنە.

٢- دەنگۆى خێرا: بۆيە ناوى خێرا، چونكە بەپەلە بڵاو دەبێتەوە، وەك ئاگرى ناو پوش وايە، ئەم جۆرەيان بەماوەيەكى كەم دەگاتە ژمارەيەكى زۆر خەڵك. ئەم جۆرانەش وەك بڵاو

بونەوەی كارەسات و، سەركەوتن و، شكست و، ئەو جۆرە بابەتانەیە كە زۆر گرنگی پیٚ دەدرێت.

٣- دەنگۆی ئاڵۆز: سەرەتا گرنگی پیٚ دەدرێت پاشان دەشارێتەوە و، دواتر لە كاتی گونجاوی خۆیدا و، هەم گرنگی پێدەدرێت و، دەردەكەوێتەوە، ئەم جۆرە دەنگۆیانە بۆ پیاوانی فەرمان ڕەوا و، دەسەڵاتدار بەشێوەیەكی شكاندنی ناو و، ناو بانگی دەگیرێتەبەر.

**هەروەها هەندێك دەروونناسی دیكەش پۆلێنێكی دیكەی بۆ دەكەن ئەوانیش:**

١- دەنگۆی خەون و، خەیاڵ: وەك لایەنێك بۆ بەتاڵكردنەوە و، خاڵی كردنەوەی ناخی مرۆڤ زۆر جار كەسەكە بەكاری دەهێنێت.

٢- دەنگۆی ترس: لەكاتی قەیران و، جەنگدا ڕودەدات.

٣- دەنگۆی ڕق لێبوون: لەكاتێكدا هەست بەوە دەكات خەڵك ڕقی لێیانە، هەندێك لە زانایان پێی دەڵێن پاڵنەری دەروونی.

<u>ليواى يەكى پاراستنى سلێمانى</u>

له توێژینەوەیەکی مەیدانیدا سەرە جۆر و، ڕێژەی بڵاو بونەوەی دەمگۆ لەناو کۆمەڵگەدا، بە پێی توێژینەوەیەك كە هەزار کەس بەشداری تیا کردووە، دەرکەوتووە کە:

١- له ٦٦٪ی دەنگۆکان دەنگۆی دوژمنە.

٢- له ٢٥٪ دەنگۆی ترسە.

٣- له ٢٪ ئاوات و، هیوا خواستنە.

٤- له ٧٪ دەنگۆکان له جۆرەکانی دیکە و، فرە چەشنن.

بەم ڕاپرسییە بێت دەردەکەوێت کە دەنگۆی ترس و، ئاوات خواستن ڕێژەی سەرکەوتنی دوژمن مسۆگەرتر دەکات.

سایکۆلۆژی دەنگۆ: دەنگۆ دیاردەیەکی دەروونییە وهەندێك نیشانە و، مانای هەیە، هەروەها پاڵنەری باشیشی هەیە بۆ ئەوەی بە خێرایی له ناو مرۆڤەکاندا بڵاو بێتەوە، بۆیە دەروونناسان دەستیان کرد بەوەی کە توێژینەوە و، خوێندنەوەی تەواوی لەسەر بکەن.

دەنگۆ دوو مەرجی سەرەکی هەیە بۆ بڵاو بونەوەی ئەم نهێنییە: مەرجی یەکەم: لەسەر گرنگی ڕوداوەکە و، پێچاوەنەوەی بەندە لەلایەن بوێژ وگوێگرەوە. مەرجی دووەم: داپۆشین و،

پێچانەوەیەتی، لە ڕاستیدا ئاوێتەیەکی تەواوی خەیاڵ و، کەتوارە لە بەردەم مرۆڤدا بە ئاسانی ناتوانی لێکیان جیا بکەیتەوە، ئەم دوو مەرجە زۆر بنەڕەتین بۆ بڵاو بونەوەی دەنگۆ، یاساکە ئاوایە (گرنگی بابەتەکە + ناڕونی= بڵاو بونەوەی دەنگۆ).

پەیوەندی نێوان ئالۆزی و، گرنگی بابەتەکە وەك پەیوەندی نێوان پێکهاتەکانی شەربەتە، واتە بە نەبونی یەکێکیان ئەوی دیکەش ئاشکرا دەبێت، ئەگەر بابەتەکە بڵاو بێتەوە بەڵام سەرچاوەکەی دیاری کراوبوو یان شاراوە نەبوو ئەوە ئاشکرایە و، کاریگەری خۆی نییە.

سێیەم: شۆردنەوەی مێشك

شۆردنەوەی مێشك چەکێکە لە چەکەکانی جەنگی دەروونی، دەهاوێژرێت بۆ کۆنتڕۆڵکردنی عەقڵ بۆ ئامانجی دیاری کراو و، دوای گرتنە بەری ئەو بنەمایانەی باسمانکرد.

(ئیدوارد هنتر)ی ئەمەریکی یەکەم کەسبو کە واژەی شۆردنەوەی مێشکی داهێنا، ئەمیشی وەك یەکێك لە کاریگەرییە نەرێنییەکانی جەنگی باسکرد، ئەم دیاردەیەك یەکەمین دیاردەبوو کە لە مێژوی جەنگەکاندا ئاماژەی پێدا و، بەکار هات،

چونکە ئەم ڕۆژنامە نوسە چەندین جار لە لایەن شیوعییەکانەوە هەوڵی ئەوەیان لەگەڵ داکە خۆیان ڕادەست بکات و، بکەوێتە ژێرکاریگەریان، بەڵام نەکەوتە بەردەستیان.

مێشك شۆردنەوە بریتییە لە: "هەمو هۆکارێك بخرێتە گەڕ بۆ شۆردنەوەی مێشك و، ڕەفتاری بەرامبەر لەسەر ئەو شتەی کە دەتەوێتیان پێشتر ئەنجامت داوە بۆ ئەو مەبەستەی ئەو کەسەی دەیەوێت".

هەندێك لە زانایان ئەم دیاردەیە بە کۆنترۆڵکردنی عەقڵی مرۆڤ و، ئاراستەکردنی بۆ ئەو ناوەی دەیەوێت ناودەبەن، واتە: دوبارە داڕشتنەوە و، گۆڕینی بیر و، مەزهەب و، بیروباوەڕ بۆ ئەو ڕێگەی مەبەست.

بەڵام ناساندنی تەواو لەم پێناسەیەدایە: "پڕۆسەی داڕشتنەوەی بیرکردنەوەی مرۆڤە، گۆڕینیەتی لەو ویستەی خۆی دەیەوێت بۆ ئەو ویستەی بەرامبەر دەیەوێت وەك: تەقینەوەیەکی گەورە وایە، چونکە لە هەوڵەکاندا وادەکات کەسەکە کارێك بکات کە لەگەڵ ویست و، بیرکردنەوەی خۆی ناگونجێت و، دژی ئامانجەکانی خۆیەتی".

## قۆناغەکانی شۆردنەوەی مێشك:

**١- قۆناغی دادگەری: واتە هەندێك زانیاری سەرەتایی بە عەقڵ دە دەیت، بۆ ئەوەی بزانیت شێوازی کاریگەر بونی بەهێزە یان نا.**

**٢- قۆناغی دژیەکی: ئەو عەقڵانەی کە زیاتر و، بە گوڕتر بەدەم بابەتەکەوە دێت وەك ئەوانەی کە بە گرانی بەدەم بانگەوە دێن.**

**٣- قۆناغی دژ یەکی توند: وەڵام دانەوەی مەرجداری هەیە بۆ هەموو دەنگۆریەك.**

## ڕێگەکانی شۆردنەوەی مێشك:

**پڕۆسەی شۆردنەوەی مێشك بە دوو ڕێگە دەبێت:**

**أ- ڕێگەی توندو تیژی.**

**ب- ڕێگەی پەروەدەی ئارامی، کە ئاسپایی کار لەسەر بەرامبەر دەکەیت.**

**ڕێگەی توندوتیژی: ئەو پڕۆسە خێرایە بوو کە لە وڵاتانی شیوعیەتدا دەستیان پێکرد و، بەخێرایی و، بەگرتنە بەری هەموو شێوەیەکی دڵڕەقانە و، دژی مرۆڤایەتی خرایە ئاراوە بۆ**

پيادەكردنى پڕۆسەكە، دەسەڵات بە ئاگر و، ئاسن كارى كرد بۆ پيادەكردنى بيروباوەڕەكەى.

**چەندين كاريگەرى نەرێنى لەسەر تاك و، كۆمەڵ دروست دەكات، قۆناغەكانى شۆردنەوەى مێشكى خێرا بە چەند هەنگاوێك بوو:**

١- دابڕانى تاك لەكۆمەڵ بەتەواوەتى و، بێبەش بوونى لە هەموو تايبەت مەندييەكانى. ڕێگەيەكى بەرچاو هەبوو كە لە بەندينخانەكان بەتايبەت گيراوە سياسييەكان دەيگرايە بەر، بۆ ئەوەى تەواوى گيراوان بە يەك جۆر بير بكەنەوە.

٢- پەستانى جەستەيى: تاكەكان توشى برسێتى و، تينوێتى و، ئازار و، چەندين هۆكارى ديكەى كارەبايى و، بەكارهێنانى مادەى هۆشبەر، بە ئامانجى ئەوەى كە تاك ئامادەى ئەوە بكەن هەر گۆڕانكارييەكى تيا بكەيت ئامادەى وەرگرتنى بێت.

٣- هەڕەشە و، توندوتيژى: ئەم شێوەيە دوو جۆرى دژ بەيەكى هەيە، يان ئەوەيە كە ڕاستەوخۆيى بەكارى دەهێنيت وەك لێدان و، بەستنەوە تا مردن، يان ئەوەيە كە بەندكراو بەسەرەو

خواری دەبەستیتەوە كە نەتوانێت بجولێت.. چەندین ڕێگەی دیكەی سزادان.

٤- ناچاركردن و، كێچەڵ پێكردن: یان ئەوەیە كە تەواوی ڕێگە چارەكان دەگریتەت بەر بۆ ئەوەی بەندییەكە ناچار بكەیت ملكەچی ئەو ویستە بێت تۆ دەتەوێت.

٥- وانەی بەكۆمەڵ: وتنەوەی وانەی بەكۆمەڵ، بۆ ئەوەی بیری نویٚ بخەیتە ناو عەقڵی ئامادەبوان، ئەمەش لە كاتی گۆڕینی دەسەلاٚتێك بۆ دەسەلاٚتێكی دیكە ڕودەدات.

٦- مامەڵەی نەرم ونیانی: سەرەتا بە نەرمی و، كار ئاسانی و، میان ڕەوی و، وتەی شیرن و، خۆش و، پیشاندانی برایەتی دەست پێدەكات، بەندییەكە دەخەیتە بەر تیشكی خۆر و، خواردنی باشی دەدەیتیٚ و، كار ئاسانی بۆ دەكەیت و، تەنانەت لە ژوری خۆت دایدەنێت و، گفتوگۆی لەگەڵ دەكەیت بۆ دەرخستنی سەرەداوێك وەك ئەوەی كە دوو هاوڕیٚ قسە دەكەن تا ئەو كاتەی كە دەگەیتە ئامانجی خۆت.

## چۆن ڕوبەڕوی جەنگی دەروونی دەبیتەوە؟

بۆ وەلاٚم دانەوەی سەرتاسەری شالاٚوەكانی جەنگی دەروونی پێویست بە دامەزراندنی وەزارەتێكی تایبەتە، یان بەشێك لە

## لیوای یەکی پاراستنی سلێمانی

وەزارەتی دەرەوە و، وەزارەتی هەرێم تایبەت بە بەڕێوەبەردنی جەنگی دەروونی، ئەویش ئەم کەرەستانەی لەبەردەستدابێت.

١- نەخشە کێشان و، خۆ ئامادەکردن بۆ جەنگی دەروونی، بەتایبەت بەر لە دەست پێکردنی جەنگ لەگەڵ دوژمن.

٢- نیشاندانی ڕاستییەکان و، ڕونکردنەوەی پڕوپاگەندەکان.

٣- بەرپەرچ دانەوەی هێرشی دوژمن و، وەڵام دانەوەی بە باشترین شێوە.

٤- دەرخستنی هۆکارەکانی دوژمن بۆ جەنگی دەروونی.

٥- دۆزینەوەی بۆچونی گشتی لەسەر ئەو ڕوداوە.

# لیوای یەکی پاراستنی سلێمانی